منداڵەکەت بۆ وا دەکات
لەبارەی پێشکەوتنی هەست و نەستی منداڵەوە لە کاتی لەدایکبوونەوە
.تاکو تەمەنی دوازدە ساڵی
ئامادەکردن و کۆکردنەوەی: شێرزاد فەقێ عەلی
Sherzad mustafa
Lindhemsvagen 48
19451 upplandsväsby
Stockholm-sweden
E- mail: sherzad_mustafa@hotmail.com
Phon:0046709532253

سەرپەرشتی زانستی : د. عەبدولباقی ئەحمەد
دکتۆری تایبەتمەندی دەروونیی منداڵ
Dr Abdulbaghi Ahmad ،MBChB ،PhD
IACAPAP Ambassador
Assisting Professor & Founder of
Child Mental Health & Metin Health House
Duhok ،Kurdistan Region - Iraq
Associate Professor & Senior Consultant in
Child and Adolescent Psychiatry
Uppsala University - Sweden
Office Phone: 0046186112555 ،fax: 0046186112565
E-mail: abdulbaghi.ahmad@neuro.uu.se

**منداڵەکەت بۆ وا دەکات**

ئامادەکردن و کۆکردنەوەی: شێرزاد فەقێ عەلی
سەرپەرشتی زانستی : د. عەبدولباقی ئەحمەد
چاپی یەکەم: سوید 1994 _ چاپی دووەم هەولێر 2013
تیراژ: 1000
نرخ: 2000 دینار
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی (چاپ: چاپخانە موکریانی (هەولێر
کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(2553) ی ساڵی
.2012پێدراوە
(زنجیرەی کتێب (714

ناوەڕۆک

**هەرچەند پیاو کەم بزانێت، وا دەزانێت کە زۆرتر دەزانێت**

**کاتێ باسی ناتەواوی خەڵکی دەکەم، بەهیوای ئەوەیە، کە سەرنجی خەڵکی ڕابکێشم بەلایەکی ترداو ناتەواوییەکانی خۆمیان پێ داپۆشم**

پێشەکی

لە کاتی منداڵیماندا، ڕەنگە زۆربەمان لەبیرمان بێ کاتێ کە لەبارەی شتێکەوە پرسیارێکمان لە گەورەکانی دەوروپشتمان دەکرد، وەڵامەکەی ئەوەبوو، کە(هەر لەکۆنەوە وابووە)، یاخود (جا جوزانم بۆ وایە ... خواوای کردووە). ئەمە وای کردووە، کۆمەڵ لە گۆڕانێک، کە ئەنجامەکەی نەزانراو بێت، بپارێزێت
بەهۆی ئەوەی، کە منداڵەکەش هەمان وەڵامی داوەتەوە بە منداڵەکانی خۆی،بوە بەهۆی مانەوەی کۆمەڵ لەشوێنی خۆی بە هەزاران ساڵ و گۆڕانی تێدا نەبووەو بەرەو پێش نەچووە
ئەمە لە یەکەمجاردا، کە سەیری دەکەین بە شتێکی باش دێتە بەرچاو و بەلای کەمەوە وا دەردەکەوێ، کە کۆمەڵی پاراستبێ و نەیهێشتبێ لەناوبچێت. ئەمە ڕاستە ، لەماوەیەکی کورتدا و لەبارودۆخێکی ناخۆش و پڕ ئاژاوەدا، بەڵام ئەگەر سەیری مێژووی دووری مرۆڤ بکەین، دەبینین تەنها ئەو گەلانە ماونەتەوە بە کلتووری زیندوو دەژمێردرێن، کە توانیویانە خۆیان بەرەوپێش بەرن، نەک ئەو کۆمەڵانە، کە خۆیان پاراستووە و بەس. چونکە ئەگەر مرۆڤ هەر هەوڵی خۆپاراستن بدات و هەوڵی بەرەوپێشچوون نەدات، ئەوا هەوڵەکەی بە زیان بۆ خۆی دەگەڕێتەوە و وەستان و خۆپاراستنی لەهەمان شوێندا، نیشانەی دواکەوتن و لەناوچوونە.
جا چۆن کۆمەڵ بەرەوپێش دەڕوات، ئەوە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زۆر نییەو تەنها ئەوە بەسە بڵێین: ئەندامانی کۆمەڵ دەبێت تێنووی فێربوون بن و بوێرن ڕێگای تازە بۆ گۆڕانی کۆمەڵ و بەرەوپێشچوون بدۆزنەوە
ئەم هەوڵە بچووکەی من لەم بابەتەیە، لە زۆر کتێبی جۆراو جۆردا گەڕاوم. بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانەی، کە ویستوومە بیزانم. هەندێ پرسیار و گفتوگۆم لەگەڵ زانایانی بواری منداڵ کردووە و ماوەی (6) ساڵیش مامۆستای سەرەتایی بووم و دوو کوڕی خۆشم هەیە کە زۆریان لێوە فێربووم و زۆربەی کات هەوڵمداوە لێیان تێ بگەم، لەئەنجامدا بۆم دەرکەوتووە، بۆ تێگەیشتن لەدنیای هەر منداڵێک دەبێت منیش بگەڕێمەوە بۆ منداڵی خۆم و بگەڕێم بەدوای ئەو وەڵامانەی کە تاکو ئێستاش نایانزانم
هۆیەکی تری هەوڵدانەکەم ئەوەبوو ، ویستم لەو چاکیانە سوود وەرگرم کە بەهۆی ژنهێنانم لە کلتوورێکی ترەوە دەستگیربووە، ئەو چاکیانەم بینی کە لە بارەی بەخێوکردنی منداڵەوە لەو کلتوورەدا هەیە، کە زۆر جار بە چاکە بۆ منداڵەکانمان گەڕاوتەوە.
نەبوونی پەرتووکی منداڵ پەروەردەکردن بە کوردی هۆیەکی تری ئەم هەوڵەم بوو، زۆر داخ لە دڵ بووم، کە کەسانی تریش وەکو من بێ بەشن لەمجۆرە پەرتووکانە و زۆر ئاسانیش نییە، کە کتێبێک بنووسی، کە تایبەت بێت بە پەروەردەکردنی منداڵی کوردەوە، بەبێ ئەوەی کە پسپۆڕێکی شارەزا بیت لەم بوارەدا.
لەکاتی ئامادەکردنی ئەم پەرتووکەدا، دایکانی کوردم لەبەرچاو بووە بە تایبەتی و مامۆستایانی پەروەردە، کە لەهەمانکاتدا دایکو باوکی منداڵانی ئەمڕۆ و پیاوانی دواڕۆژمانن بە گشتی، لەگەڵ ئەمەشدا هەموو ئەوانەی کە بەهەرجۆرێک پەیوەندییان بە بەخێوکردنی منداڵەوە هەیە، دەتوانن سوود لەم پەرتوکە وەربگرن.

ئەم پەرتووکە چۆن بەکاردەهێنرێ؟
زۆر کەس کە بیەوێ بە شێوەیەکی گشتی لە جیهانی منداڵ بگات، یان چاوێک بە ڕۆژانی ڕابردووی خۆیدا بخشێنێتەوە ، ئەوا دەتوانێت ئەم پەرتووکە بخوێنێتەوە و خوێندنەوەی جارێکیش بەسە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ بە وردی لە بابەتەکان بگەن. ئەوە باشتر وایە ئەو بەشە بخوێننەوە کە پەیوەندی بە منداڵەکەی ئەوانەوە هەیە، لەبەرئەوەی پەرتوکەکە، بەپێی گەورەبوونی منداڵ دابەشکراوەتە سەر بەشی جیاواز، نموونە: ئەگەر دەتەوێت شتێک لەبارەی دروستبوونی ویژدانەوە بزانی، ئەوا .دەتوانی لەبەشی (2 و 3 و 4) دا بۆی بگەڕێیت
لێرەشەوە پێمخۆشە زۆر سوپاسی هەموو ئەو کەس و لایەنانە بکەم کە بۆ هێنانەدی ئەم پەرتووکە یارمەتیان داوم، بەتایبەتی هاوڕێیانی خۆشەویستم دکتۆر عەبدولباقی ئەحمەد، کە بەهۆی شارەزایی لەبارەی منداڵەوە ئەرکی پیاچوونەوەی کتێبەکەی گرتە ئەستۆ و خەبات عارف کە لە نووسینەوە و پێداچوونەوەی زمانی نووسینی کتێبەکەدا هاوکاری کردم.
هیوادارم ، خوێنەری خۆشەویست، ڕەخنەو پێشنیارو پرسیاری خۆی بۆ ئەم ناونیشانەی خوارەوە بنێرێت، بۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا .زیاتر و باشتر، بتوانین بە هەمووومان خزمەتێک بە کۆمەڵگاکەمان بگەیەنین
پەندێکی پێشینانی چینی هەیە دەڵێت:

ئەوەی بتوانێت تەنها (یەک) ساڵ چاوەڕوان بکات، تۆوێک دەچێنێت
ئەوەی بتوانێت تەنها (دە) ساڵ چاوەڕوان بکات، دارێک دەڕوێنێت
ئەوەی بتوانێت (سەد) ساڵ چاوەڕوان بکات، خەڵکی پەروەردە دەکات

## بەشی یەکەم

## منداڵی ساوا

## (ساڵی یەکەم)

گەورەبوونی منداڵ
لە ساڵی یەکەمی منداڵیدا، منداڵ نزیکەی 20 سانتیمەتر گەورە دەبێت، مانای ئەوەیە کە لە 40% درێژی و نزیکەی 7 کیلۆ لە کێشی زیاد دەکات، بە مانای ئەوەی سێ هەندەی کێشی زیاتر لەکاتی لە دایکبوونی.
دەماغی منداڵ دەبێت بەدوو ئەوەندە، دەمارەکانی مۆخی ئەوەندە پێش دەکەون کە دەتوانێ دەست بەسەر جووڵانەوەی خۆیدا بگرێت و ئەندامەکانی لەشی وەک: دەست و قاچ و سەرو مل ڕابگرێت و بەشەکانی لەشی بەبەراورد لەگەڵ یەکتردا، بە جارێ دەگۆڕێت و سیمایەکی تایبەتی بە منداڵەکە دەدات، دەموچاوێکی خڕو کراوە و پڕ مانا پەیدا دەبێت.
لە ماوەی ساڵەکەدا، ئەو منداڵە بێ دەسەڵاتەی جاران، دەبێت بە ئەندامێکی بزێو و بەهەموو جۆرێک، بە چاو و بە دەست ، بەدوای شتی تازەدا دەگەڕێت، بۆئەوەی بیان پشکێنێت، خۆی دەخولێنێتەوە، دادەنیشێ، دەخشێ و گڕوگاڵ دەکات، هەر خەریکی دۆزینەوەی شتی تازەیەو هەوڵدەدات زیاتر شت فێربێت. تەنها لە ماوەیەی ساڵێکدا، ئەم منداڵە ساوایە دەبێت بە ئادەمیزادێکی تەواو و هەوڵدەدات قسە بکات، هەست و زیرەکی زۆر بەخێرایی پێشدەکەوێت، لەوەی کە جاران لە دەورووپشتی ورد دەبۆوە، ئێستا بە تەواوی هاتۆتە ناو ژیانی خێزانەکەوە لەگەڵ هەر یەک لە ئەندامانی خێزانەکەدا هەوڵی دروستکردنی پەیوەندی دەدات، لەوەی کە جاران هیچی نەدەزانی لە بارەی ئەوانەی دەورویشتیەوە، ئێستا خۆی خەریکە ببێت بەیەکێک لەوان.
لەماوەی ئەم چەند مانگەدا کە تێپەڕی، بەردی بناغەی هەموو پێشکەوتنێک بۆ دواڕۆژ دادەڕێژێ، نەک تەنها بۆ ژیانێکی ئاسوودەو بەسۆز، بەڵکو بۆ بنیادنانی کەسایەتیی خۆی و پلەی پێشکەوتنی لەدواڕۆژدا. **(هیچ قۆناغێک لە ژیانیدا ئەوەندەی ئەم قۆناغە بۆی گرینگ نییە)**. لەبەرئەوە با زیاتر لە ژیانی منداڵی ساوا وردبینەوە و خۆمان زیاتر فێربکەین کە چۆن منداڵ پەروەردە دەکەین بەداخەوە لە کۆمەڵی کوردەواریماندا گرنگییەکی وا بە ساڵی یەکەمی منداڵ نەدراوە و بە دەگمەن کتێبێک دەست دەکەوێت کە باسی منداڵ و چۆنیەتی پەروەردەکردنی منداڵ بکات. بە دەگمەنیش دایکێک هەیە لە بارەی منداڵ و پەروەردەکردنیەوە شتێک بخوێنێتەوە. ئەمانەش هۆی تایبەتی خۆیان هەیە و پێویست ناکات لێرەدا باسیان بکەین. بەڵام پەروەردەکردنی منداڵ ئەوەندە گرنگە و ئەوەندە کار دەکاتە سەر دواڕۆژی هەریەک لە ئەندامانی کۆمەڵ و هەموو کۆمەڵ بە گشتی، کە هیچ بیانوویەک ڕێ بە خوێندەوار و ڕۆشنبیرەکان

نادات، کە ئەم ئەرکە فەرامۆش بکەن و هەوڵ نەدەن دایکانوباوکان ئاگاداربکەنەوە لەگرنگی ئەم کارە، کە زۆرجار لە کەمتەرخەمی زیاتر بەولاوە، هیچ بیانوویەک نییە پەنای بۆ بەرن.
لێرەدا دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت کە کۆمەڵی کوردەواریمان لە ماوەی 50 ساڵی ڕابردوودا بە چ دەردێک براوە و لەژێر چ بارودۆخێکدا ژیاوە. ڕژێمی دیکتاتۆری نەک تەنها کوردی کوشتووە و کوردستانی داگیرکردووە، بەڵکو زیانێکی زۆریشی لە دەروون و کەسایەتیی مرۆڤی کورد داوە و ڕێی نەداوە لەگەڵ ڕەوتی ئاسایی گەشەکردنی سروشتیدا لە هەنگاوی بەرەوپێشچووندا بێت، ئەمەیش تەنها بە هەوڵ و تەقەلاو یارمەتی هەموو لایەک دەگەڕێندرێتەوە بۆ باری سروشتی و ئاسایی و دۆخی جارانی خۆی و لەوێشەوە بەرەوپێش دەبرێت. (هەروەک چۆن گوند و شارە ڕووخێنراوەکانی کوردستان پێویستی بە دروستکردنەوە هەیە. ئاواش دەروون و کەسایەتی مرۆڤی کورد پێویستی بە بنیادنانەوە هەیە

جیهانی منداڵی ساوا
منداڵی ساوا دێتە جیهانەوەو هەموو پێویستییەکی گەورە بوون و پێشکەوتنی لەگەڵ خۆی هێناوە، هەر لە ساتەکانی دوای لە ، ڕووی خۆی بەرەو شوێنی ئەگەر مرۆڤ دەست لە لێو یان ڕوومەتی منداڵی ساوا بدات، منداڵەکە سەر وەردەگێڕێ بەو لایەدا و هەوڵدەدات دەمی بگەیەنێتە پەنجەکە و بیمژێ لەبەرئەوەی توانای منداڵ بۆ ژیان لەوەدایە، کە دەتوانێت خواردن بخوات. ئەم خووەی هەر لە منداڵییەوە هەیە. هەروەها منداڵی ساوا خوویەکی تریشی لەگەڵە، کە ئەویش خۆ پاراستنە لە ئازار، کاتێ کە تیشکێکی (REFLEX) بەهێز لە چاوی ئەدەیت. ڕووی خۆی وەردەگێڕێت. ئەگەر پەنجەیەک بخەیتە ناو دەستی منداڵەکەوە ئەوەندە توند پەنجەکەت دەگرێت، کە بەسە بۆ ئەوەی بتوانێت بەرزی بکەیتەوە. ئەم خوی خۆ گرتنە لە ئەمریکا پێی دەوترێت(خوی باوک)و زۆر لە شارەزایان پێیان وایە کە ئەم خوە وا لە باوک دەکات بڕوای بەوە بێت، کە منداڵەکەی دەیناسێتەوە.
منداڵی ساوا لە دنیایەکی تەماویدا دەژی، کە زۆر جیاوازە لە جیهانی گەورەکان و هیچ توانای بیرکردنەوەی نییە و نازانێت ئەمیش کەسێکە و جیایە لە خەڵکی تر و ناشتوانێت ئەندامێک لە ئەندامەکانی تری لەشی خۆی جیابکاتەوە. زۆرترین کاتی بە نووستن بەسەر دەبات، کە نزیکەی 20 کاتژمێرە لە شەوو ڕۆژێکدا
لەم سەرەتای ژیانەدا منداڵ پێویستی بە (خەو و گەرمی و شیر) هەیە ، کە زۆر گرنگن بۆ ئەو پێگەیشتنە خێرایەی کە منداڵەکە پێیدا تێدەپەڕێت، هەموو ژیانی منالەکە لەوە دەچێت، کە هەر نانخواردن و نووستن بێت، ساوا نازانێت کە برسییەتی بەڵکو هەست بە برسێتی دەکات و تەنها ڕێگایەکیش بۆ ڕاگەیاندنی برسیەتییەکەی گریانە.
ئەم خوە هەر لە دایکبوونەوە لەگەڵ منداڵەکەدا هەیە و باشترین چەکە بە دەست منداڵەکەوە کەوا لە دایکەکە بکات کە بە دەنگیەوە بێت و پێویستیەکانی جێبەجێ بکات. ئەم خوە هەر لەکاتی لەدایکبوونەوە، لەلای هەموو منداڵێک هەیە، بەڵام لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر دەگۆڕێت و جیاوازە.

.........................................هیچ منداڵێک لەوی تر ناچێت.................................
هەموو منداڵێکی ساوا هەمان پێویستی و هەمان خویان هەیە، بەڵام هەریەکەی بە شێوەیەکی جیاواز دەری دەبڕێت. ئەم منداڵەیان بە ئاسانی و بە دەنگێکی کەم خەبەری دەبێتەوە و ئەویتریان خەوی زۆر قورسە و لەکاتی نووستندا گوێ بە دەوروپشتەکەی خۆی نادات. ئەم منداڵەیان لەسەرخۆ و هێمن و بێدەنگ خەبەری دەبێتەوە، ئەویتریان بە گریان و زریکە زریکەوە خەبەری دەبێتەوە، هەندێ منداڵ بزێون و هەندێکی تریان هێمن و لەسەرخۆن. هەندێ حەز لە باوەش دەکەن و هەندێکی تر بە پێچەوانەوە، هەر منداڵە و بە جۆرێک وا لە کەسانی دەوروپشتی خۆی دەکات، کە لێی تێبگەن و پێویستییەکانی بۆ جێبەجێ بکەن، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە پەیوەندی لەنێوان منداڵ و گەورەدا، هەر لەم قۆناغەوە، کار دەکاتە سەر جۆری کەسایەتی و پێشکەوتنی منداڵەکە.
لە تەمەنی ساوایەتیدا بەجێهێنانی هەموو پێویستییەکانی منداڵ، لە خواردن و پاک و تەمیزی و ئاگاداری دەکەوێتە سەر شانی دایک، منداڵ لە تافی ساواییدا زۆر دەنوێت، ئەمەش یارمەتیدەرێکە بۆئەوەی دایک و منداڵ زیاتر پێکەوە بن و هەر لەوماوەیەشدایە کە ئەو گۆڕان و پێشکەوتنەی، کە لە پاشەڕۆژدا دەردەکەون، کار لە منداڵەکە دەکەن، کەواتە مانگەکانی یەکەمی ژیان، لەوە گرنگترە کە هەر بریتی بێت لە خواردن و نووستن.
پێش چەند ساڵێک لەمەوبەر پرۆفیسۆرانی (شیکردنەوەی دەروونی و مێشکی منداڵ) لەسەر منداڵ و پەیوەندی دەروونی و مێشکی منداڵ لەگەڵ کەسانی دەوروپشتیاندا توێژینەوەیان کردووە و دوو گرووپیان لە منالان پێکهێناوە و لە تاقیکردنەوەدا دەرکەوتووە، بەجۆرێک کە گرووپی یەکەم تەنیا پێویستییەکانی خواردن و پاکو تەمیزیان بۆ جێبەجێکراوە، بێ ئەوەی ئەوانەی کە دەچنە لایان ڕێیان پێ بدرێت قسەیان لەگەڵ بکەن و لە باوەشیان بگرن. گرووپی دووەم بە پێچەوانەوە زیاتر گرنگیان پێدراوە و پێویستییەکانی مێشکی و دەروونی و ڕۆحیان بۆ جێبەجێ کراوە، لە ئەنجامدا دەرکەوتووە کە منداڵانی گرووپی یەکەم زۆر دواکەوتوون و لە تەمەنی دوو ساڵ و دوو ساڵ و نیویشدا نەیانتوانیوە قسە بکەن و نەخۆشی و هەڵاوسانی ئەندامەکانی لەش لەناویاندا هەبووە و تەنانەت لێشیان مردووە. بە کورتی ئەو منداڵانەی کە لە ساڵی یەکەمدا تەنها پێویستییەکانی لەشیان بۆ جێبەجێ کراوە و هیچ پێویستی دەروونی و مێشکی و ڕۆحیان بۆ جێبەجێ نەکراوە و لەزۆر ڕووەوە، دواکەوتووتر بوون لەو منداڵانەی کە گرنگی بە هەردوو پێویستییەکانیان دەدرا، کەواتە پەروەردەکردنی منداڵ لەوە زیاتر کە تەنها خواردنی بدەیتێ و جلەکانی بگۆڕیت و پاک ڕای بگریت.

پەروەردەکردن بریتییە: لە کۆمەڵێ هەڵسوکەوت، کە لەو هەست و نەستە گەرموگوڕەوە سەرچاوە دەگرێت کە دایکوباوک بەرانبەر بە منداڵ دەریدەبڕن لە کاتی نانخواردن و جلگۆڕین و یاریکردندا، ئەم هەڵسوکەوتانە بە شێوەیەکی ئاسایی دەڕوات و زۆرجار دایکو باوک بێئاگان لەوەی کە بەم هەڵسوکەوتانەیان بەشێکی زۆر گرنگ لە پەروەردەکردن ئەدەن بە منالەکە، بەبێ ئەوەی خۆیان سەغڵەت بکەن.

زۆر کەس پێی وایە دایک بە شێوەیەکی سروشتی، لەبەرئەوەی دایکە لەوە ئاگادارە بە چ جۆرێک هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵەکەیدا دەکات. ئەمە تا ڕاددەیەک ڕاستە و یارمەتی دایک دەدات بۆ بەخێوکردنی منداڵەکەی، بەڵام تەنها ئەوە بەس نییە بۆ ئەوەی ببێت بە دایکێکی باش و دەرئەنجام منداڵێکی ژیر بهێنێتە کایەوە. پێویستە دایکوباوک هەوڵ بدەن کە زیاتر لە منداڵەکەیان بگەن، چونکە جیهانی ئەوان جیاوازە لەو جیهانەی کە منداڵەکە تێیدا دەژی.

هەروەکو پێشتر وتمان، هەر منداڵەو لە منداڵێکی تر جیاوازە و هەروەهاش پەیوەندی (منداڵ – دایکوباوک) یش جیاوازەو هیچ پەیوەندیەک لەوی تر ناچێت. جا بۆیە پەیوەندی تۆ لەگەڵ منداڵەکەتدا لە پەیوەندی دراوسێکەت ناچێت لەگەڵ منداڵەکەیدا، گەرچی منداڵەکانیشتان لەیەک تەمەندا بن، هەر بۆیە لە جیاتی ئەوەی دانیشی و بەراوردی خۆت و منداڵەکەت لەگەڵ دراوسێکەتدا بکەیت و خەفەت بخوێت بەوەی کە منالەکەی ئەو باشترە یان نا، باشتر وایە گرنگی بەو پەیوەندی و خۆشەویستییە بدەیت، کە لەنێوان تۆ و منداڵەکەت و ئەندامانی تری ناو خێزانەکەتدا هەیە.

لێرەدا دەتوانیت باس لە گرنگییەکی تایبەتی لە نێوان دایک و منداڵ بکەین، کە ئەویش پێدانی(شیر)ە لەلایەن دایکەوە، کە هەندێکجار دەبێت بەهۆی بە هەڵە لە یەکگەیشتن لە نێوانیاندا و پەیوەندیان خراپ دەبێت و وا لە منداڵەکە دەکات کە بگری و دایکەکەش شک لە خۆی بکات کە ئایا ڕاست هەڵسوکەوت دەکات یان نا، دایکێک کە زۆر گورج و گۆڵەو بە کارەو حەزئەکات هەردەم لە جووڵاندا بێت و منداڵەکەش لەکاتی شیرخواردندا زۆر بە شەوقەوە مەمکی دایکەکەی دەمژێ و بەتوندی دەی گرێت وا دەبێت بەهۆی ڕێککەوتنی تەواو لەنێوانی دایک و منداڵەکەدا و هەردووکیان بەو پەیوەندییە ڕازی دەبن و دەبێتە هۆی ئارامی بەخشین بە هەردوولا. بەڵام خۆ ئەگەر منداڵەکە منداڵێکی لات و سارد و سڕ بێت لە مەمک مژیندا و بەنارێکی برسی بێت، ئەوا دایکەکە نازانێ کەی منداڵەکەی برسی دەبێت و کەی پێویستە شیری بداتێ و دەبێت بەهۆی نارەحەتی دایک لە شیرداندا و نارەزایی دەربڕین و تێکدانی پەیوەندی نێوانیان.

ئەم سەرپێشک نەبوونیەی دایک لە بارەی شیردان بە منداڵەکەوە وای لێدەکات کە شک (شککردنەکە لە ڕاستیدا ڕاست نییە**!**) لەخۆی بکات کە دایکێکی باشە، لە جیاتی ئەوەی وای لێ بێت بەم هەستە نا ڕاستە بڕوا بکات، باشتر وایە کە بزانێت کە هەر پەیوەندییەک لە مابەینی دایک و منداڵدا پەیوەندیەکی تاکانە و جیاوازە لەوجۆرە پەیوەندییەی کە لە مابەینی منداڵێک و دایکێکی تردا هەیە.

ئەم بە هەڵە لەیەکگەیشتنە شتێکی ئاساییە و زۆرجار لەنێوان دایک و منداڵدا ڕوودەدات و دەبێت بەهۆی تێکدانی پەیوەندیی نێوانیان، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دایکەکە دایکێکی خراپە، هەموو دایکێک لە توانایدا هەیە فێری منداڵ بەخێوکردن ببێت، بەوەی کە منداڵەکەی بناسێت و بزانێت کەی پێویستییەکانی بۆ جێبەجێ دەکات. ئەم ناسینەش کاتی دەوێت و لەو ماوەیەدا هەردوولا هێمن دەبنەوە و زیاتر سەرپێشک دەبن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی پێکهێنانی ژیانێکی خۆش و لەسەرخۆ لەناو خێزاندا کە منداڵەکە هەستی پێدەکات و دەبێت بەهۆی ڕازیبوونی لە دایک و لە ژیان.

کەواتە هەردووکیان (دایک و منداڵەکە)ش کار دەکەنە سەر پەیوەندیی نێوانیان لەچۆنیەتی و چەندایەتیدا، توانای ئەوەی کە دایکوباوک بتوانن ژیانێکی ئاسوودە بهێننە کایەوە بۆ خۆیان و منداڵەکەیان هەر بە ئاسانی نایەتە کایەوە، ئەوانی کە منداڵیان بەخێوکردووە، ئەزانن کە منداڵ کار دەکاتە سەر گەورەکان و گەورەکان کار دەکەنە سەر منداڵەکە و بەم هۆیەوە هەست و نەستی جیاواز و کۆن دەبووژێتەوە و گەورەکان منداڵیی خۆیان وەکو شریتێکی سینەما دێتەوە بەرچاو.

لە ساڵی یەکەمی ژیاندا، منداڵ پێویستی بە ئەرکێکی یەکجار زۆر هەیە، چ لەلایەن دایکەوە چ لەلایەن باوکەوە. لە کۆمەڵی ئێمەدا، باوک دەچێتە دەرەوەو کاری پەیداکردنی بژێوی خێزانەکەی لەسەرە، زۆر گرانە کە لە ساڵی یەکەمدا بتوانێت یارمەتییەکی ئەتۆی دایکەکە بدات لە بارەی خواردن و پاکو تەمیزی منداڵەکەوە، بەڵام دەتوانێت بەلای کەمەوە نەختێ لە زەحمەتی دایکەکە کەم بکاتەوە، کە شەونەخوونییەکی زۆر دەکێشێت و لە ماوەی ساڵی یەکەمدا ، هەموو شەوێک چەند جارێک خەبەری دەبێتەوە و ئاگای لە منداڵەکە دەبێت، لەم کاتەدا، یارمەتی باوک بۆ دایک و منداڵەکە دەکرێت ئەوە بێت هەندێ لە داواکانی خۆی کەم بکاتەوە و هەندێ لە کارەکانی خۆی بکات، وەکو ئاو خواردنەوەو داواکردنی هێنانی شتی جۆراوجۆر کە دایکەکە دەبێت بۆی جێبەجێ بکات. ئەم یارمەتییە زۆرە بۆ دایکەکە و دەبێت بەهۆی ئەوەی، کە پشوویەک بەخۆی بدات و بتوانێت بەردەوام بێت لە پەروەردەکرنی منداڵەکەی بەشێوەیەکی ڕێکوپێک ترو بە ڕوویەکی خۆشترەوە، وەک لەوەی بەناچاری و بەڕوویەکی هیلاک و نارەزاییەوە داواکارییەکانی منداڵەکەی جێبەجێ بکات، چونکە وەکو وتمان (منداڵ هەست دەکات کە بە چ شێوەیەک پێویستییەکانی بۆ جێبەجێ دەکرێت). هەروەها باوکان بەهۆی ئەوەی کە ئیشوکاری پەیداکردنی بژێوی خێزانەکەیان لەسەرە دوورن لە منداڵەکەوە بەتایبەتی لە ساڵی یەکەمدا. لەبەرئەوە زۆر ئاگایان لە ژیانی ڕۆژانەی دایک و منداڵەکە نییە و کاتێکیش باوک بە هیلاکی دێتەوە ماڵەوە، ناتوانێت بە هیچ کارێکی تر هەڵسێت و پێویستی بە پشوودانە، لێرەدا لەسەر دایکەکە پێویستە، کە ئاگاداری ئەم بارو دۆخەبێت و لە هەلێکی باشدا و دوای پشوودانی باوکەکە باسی بارودۆخی خۆی و منداڵەکەی بۆ بکات و بۆی ڕوونبکاتەوە کە ژیانی چۆن لەگەڵ منداڵە ساواکەدا بەسەر بردووەو پێویستی بەچی هەیە، چونکە وەکو وتمان پێویستی تەنها خواردن و جلگۆڕین نییە.

لێرەدا نووسراوەکەی نووسەری مەزنی ئەرمەنی (خەچاتور ئەبوڤیان) کە شارەزاییەکی تەواوی لە ژیانی کوردەواریدا هەیە، هاتەوە بیر کە لە کتێبەکەی (ن.م. خەلفین)دا، خەبات لەرێی کوردستاندا)، ل32 دا نووسراوەو دەڵێت:(بە پێچەوانەی گەلانی تری

ڕۆژهەڵاتەوە، کورد ڕێزێکی زۆری ئافرەت دەگرێت). ئەبوڤیان گەیشتە ئەنجامێک کە بڵێت: (ئەتوانین کورد بە شاسواری ڕۆژهەڵات (لە پیاوەتی و مرۆڤایەتیدا دابنێین) ئەگەر بهاتایە و ژیانێکی نیشتەجێی چەسپاوەیان ببووایە). لەدوایدا دەتوانین بڵێین: کە منداڵی ساوا کەسێکی تایبەتە بەخۆی و پێویستی بەهەموو جۆرە خۆشەویستییەک هەیە، هەروەها دایکوباوکیشی( کەسانی تایبەت بە خۆیانن) و پێویستیان بەهەموو جۆرە خۆشەویستییەک هەیە و بەجۆری جیاواز خۆشەویستی خۆیان دەردەبڕن، هەرچەندە زۆرجار لەبەر هیلاکی و ئازار و تەشقەڵەی ژیان لە منداڵەکەش تووڕە دەبن و دڵیان لێی دێشێ.
لەپەرتوکی(مندالەکەت بۆ وا ئەکات)

## زەردەخەنەی منداڵ

لەدەوروبەری تەمەنی شەش هەفتەییدا، شتێکی زۆر سەیر و خۆش ڕوودەدات، کە پەیوەندی دایک لەگەڵ منداڵەکەیدا دەگۆڕێت، ئەوەیش زەردەخەنەیە و شتێکی کۆمەڵایەتی نییە و بۆ کەسێکی تایبەت نییە، بەڵام لە پڕێکا دەبینی، کە منداڵەکەت زەردەخەنەت بۆ دەکات و ئەم زەردەخەنەیەش هەر بەتایبەتی بۆ تۆ نییەو منداڵ ڕووی هەر مرۆڤێک ببینێ یاخود تەنانەت ئەگەر دوو بازنە لەسەر مقەبایەکی سێسووچ بکەیت ئەوا منداڵەکە زەردەخەنەی بۆ دەکات، منداڵ بۆ هەموو شتێک کە لەڕووی مرۆڤ بچێت، زەردەخەنە دەیگرێت و لەم تەمەنەدا ناتوانێت بە تەواوی ڕووی خەڵکی لەیەکتر جیابکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دایکوباوکی دڵخۆش دەبن، کە منداڵەکەیان زەردەخەنە بیگرێ، ئەم زەردەخەنەیە وا لە دایکوباوک دەکات کە هەست بکەن لەگەڵ مرۆڤێکدا دەژین کە ئەزانێت خۆشی و ناخۆشی چییەو ئەتوانێ هەستی ڕەزامەندیی خۆی دەربڕێ. ئەم ڕووداوە گرنگییەکی تایبەتی بۆ باوک هەیە، کە هەتا ئەوکاتە پەیوەندییەکی توندی لەگەڵ منداڵەکەیدا نەبووە.

لەم تەمەنەدا دایکان و باوکان زۆر هەوڵدەدەن. کە منداڵەکەیان بخەنە زەردەخەنەو بۆ ئەم مەبەستە زۆر شت دەکەن و دەموچاوی خۆیان بەهەموو شێوەیەک دەگۆڕن و چەقەنەی بۆ لێدەدەن، ئەمە زیاتر پەیوەندی نێوانیان توندوتۆڵتر دەکات.

لەتەمەنی سێ مانگیدا، منداڵەکە وای لێدێت بەڕووی دایکی پێ دەکەنێ، ئەمە هەنگاوێکی گەورەیە لە پێشکەوتنی منداڵدا، چونکە دەری دەخات کە دایکی دەناسێتەوە و ئەو کەسێکی تایبەتە بۆی و ڕووی ئەو جیاوازە لەڕووی یەکێکی تر. بەمە گۆڕانێکی گەورە لە مێشک و هەستی منداڵەکەدا ڕوودەدات. منداڵەکە فێری ئەوە دەبێت، کە جیاوازی لەنێوانی خۆی و خەڵکی تر و لە نێوانی دایکوباوک بکات. ئەم زەردەخەنەیە ، زەردەخەنەیەکی کۆمەڵایەتییە و پێشکەش بە خێزانەکەی دەکات وەکو پێزانینێک بەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیەی کە ئەندامانی خێزانەکە لەگەڵیدا کێشاویانە بەمەش ئەو پەیوەندییە لەنێوانی منداڵی ساواو ئەوانەی دەورپشتیدا دروست دەبێت.

لێردا دەمەوێت سەرنج بۆ ئەو هەموو ئەرکە ڕابکێشم کە دایکەکە لەماوەی ئەو سێ مانگەی ڕابردوودا کێشاویەتی و زۆرجار گەیشتۆتە ئەوەی کە بە تەواوەتی لە ژیانی خۆی وەڕز بووەو حەزیکردووە دوور بکەوێتەوە، بەڵام زەردەخەنەی ئێستای منداڵەکەی و پێکەنینی چەند مانگێکی تری وا لە دایکەکە دەکات کە ورە بەرنەداو هێزی تازەی پێ ببەخشێ بۆ بەردەوامبوون لە بەخێوکردنی منداڵەکەی، چونکە دایکەکە ئێستا پاداشتی کارەکەی وەردەگرێتەوەو دەزانێت کە ڕەنجکێشان و شەونخونیەکانی بەفیڕۆ نەچووە.

## پێشکەوتنی تری منداڵ لە سێ مانگیدا

لەماوەی ئەم سێ مانگەدا، گۆڕان لەهەموو ڕوویەکی کۆمەڵایەتی هەست، مێشک و لەش لە منداڵدا زۆر بەخێرایی ڕوودەدات، ئەگەر جیاوازی هەبوو لەنێوانی منداڵەکەی تۆ لەگەڵ منداڵێکی تردا، ئەوا دڵت سەغڵەت نەبێت و خۆت نارەحەت مەکە، چونکە شتێکی ئاساییە کە هەر منداڵە و لەویتر جیاوازە. جا ئەگەر منداڵەکەت شەش هەفتە دوای منداڵەکی تر دەستی بە گاگۆڵکەکردن کرد ئەوا شتێکی ئاساییە. ئەم منداڵە هەموو شەو و ڕۆژەکە دەنوێت، تەنها برسێتییە کە خەبەری دەکاتەوە. زۆربەی منداڵ خەبەری دەبێتەوە و لەناو جێگاکەیدا دەست بە گڕوگاڵ دەکات. یاخود بەبێ دەنگی سەیری ئەو یاریانە دەکات کە لەسەر سەرییەوە هەڵواسراوە، بەڵام لە تەمەنی سێ مانگی بەرەوژوور گۆڕانێک ڕوودەدات. ئەویش ئەوەیە، کە منداڵ بەڕۆژ زیاتر بەخەبەرە و بەشەو دەنوێت، بۆیە ئەگەر منداڵ بەشەو چەند جارێک خەبەری بووەوە، ئەوە شتێکی ئاساییە و لەوانەیە برسی بێت یان خۆی پیس کردبێت یان لەبەرئەوەی زۆر یان بە هەڵە شیرەکەی خواردووە یان لە مەمک مژیندا پەلەی کردووە و هەوا چوویتە سکییەوە. زۆربەی منداڵان تا تەمەنی یەک ساڵان بەمشێوەیەن.

هەروەها هەڵسانی بەیانیانی منداڵ دەگۆڕێت تا ئێستا منداڵ کە خەبەری بۆتەوە هاواری کردووە، بەڵام ئیتر لە مەودوا منداڵ نەختێک چاوەڕێ دەکات و پێشی خۆشە کە چەند ساتێک بەتەنها بە خەبەربێت و دەورووپشتی خۆی بپشکنێ و یاری بە دەستەکانی بکات. جا لەبەرئەوەی ئێستا دەتوانێت خۆی بخلافێنێ، بۆیە دەتوانێت نەختێ چاوەڕوانی هاتنی دایکیشی بکات و لەم تەمەنەدا گڕوگاڵی منداڵ زیاد دەکات و جارجار پێکەنینی کورت دەبیسترێ، وەک وەڵامێک بۆ ئەو شتانەی، کە دایک دەیانڵێت و دەیانکات. ئەم گۆڕانە زیاتر دایکوباوک دڵخۆش دەکات و هەموو شتێک دەکەن بۆ ئەوەی منداڵەکە زیاتر پێبکەنی و گڕوگاڵی زیاتر بکات.

لەم تەمەنەدا ماسوولکەکانی منداڵ زیاتر خۆیان دەگرن بۆیە هەوڵدەدات خۆی نزیک بکاتەوە لەو شتومەکانەی کە لە دەوروبەریەتی و لە چوارمانگیدا هەوڵدەدات، بە دەست شت بگرێت، ئەگەر سەیری بکەیت دەبینیت کە چۆن هەوڵدەدات دەست و پەنجەی بە شێوەیەک ڕێک بخات ، تا بتوانێ شت بگرێت.

لە تەمەنی (4- 5) مانگیدا منداڵ دەتوانێ شەقشەقە و بازنە بگرێت و خۆی پێیانەوە خەریک بکات و یاریان پێ بکات.

لە دەورووبەری(5)مانگیدا منداڵ دەتوانێت دابنیشێ، ئەگەر سەری بەدەستی خۆت بگریت. لە(6)مانگیدا بەبێ یارمەتی دادەنیشێت، لەم تەمەنەدا منداڵ دەتوانێ چوار مەشقی بەبێ یارمەتی دابنیشێت، بەڵام نابێ دڵگیربین لەوەی کە منداڵ لووت لە زەوی دەدات و شۆڕ دەبێتەوە، چونکە ماسوولکە هەڵگرەکان هێشتا لاوازن و تەنیا بۆ ساتێکی کورت ڕێ بە دانیشتنی منداڵ دەدەن.

هەر لەم تەمەنەدا منداڵ دەتوانێت ، لەسەر سک بۆ سەر پشت و بە پێچەوانەوە خۆی وەربگێڕێت و دەتوانێت لەسەر کورسییەکی منداڵاندا دابنیشێت و خواردنی بدرێتێ و هەوڵیش دەدات، کە خۆی خواردنەکە بخوات. بەڵام وێنەیەکی سەیرو سەمەرە دروست دەبێ .کە دەورووپشتی بە خۆشییەوە پێی پێ دەکەن.

لەم تەمەنەدا منداڵ فێری ژەمی نانخواردنی خێزانەکە بووە و لەگەڵ خێزانەکەدا نان دەخوات و لەگەڵ ئەوەش کە لە مابەینی دوو ژەمی خواردندا ئەم ژەمێکی تری خۆی دەخوات.

پێوەندی بە یەکەوە دروستکردن

ئەم منداڵە ساوایە مرۆڤێکی کۆمەڵایەتیی نییە، بەڵام لە ماوەی ئەم ساڵەدا فێری ئەوە بووە کە زۆر لەپەیوەندی کۆمەڵایەتیی تێبگات. لەمانە: دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ دایکدا، کە ئەمە زۆر پێویستە بۆ دروستکردنی پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی ڕاست و بنیادنانی هەست و نەستێکی باش لە پاشەڕۆژدا.

وەکو دایک، ئەم پەیوەندییە هەر لەوکاتەوەی دایک چاوی بە منداڵەکەی دەکەوێت، دروست دەبێت و منداڵەکە ئەم پەیوەندییە بە قۆناغی یەک لەدوای یەک دروست دەکات. لە پێشا لەگەڵ دایکەکەداو دوایش لەگەڵ ئەندامانی تری خێزانەکەیدا، ئەم پەیوەندییە بەهۆی بوونی دایک و جێبەجێکردنی پێویستیەکانی منداڵ لە کاتی پێویستدا و ئەو خۆشەویستی و شەونخونییەی کە دایکەکە پێشکەشی منداڵەکەی دەکات، پەرە دەسێنێت.

ئەم بەیەکەوە بەستەنەوەیە بە دایکوباوک و ئەندامانی تری خێزانەکەوە زۆر گرنگە و بەردی بناغەی خۆشەویستی منداڵ بۆ ئەندامانی دەرەوەی خێزانەکەش دادەنێ و لەهەمانکاتدا هەستونەستی منداڵەکە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە بەهێز دەکات، لێرەوە منداڵ گوێ بە دەرەوەی خێزان دەدات و بە دوای سەربەخۆیی و متمانەبەخۆکردندا دەگەڕێت.

لە کۆمەڵی ئێمەدا کە لەیەک کەس زیاتر منداڵ پەروەردە دەکات و هەموو ئەندامانی خێزان و بگرە کەسانی نزیک لە خێزانیش ، وەک مام و خاڵ و برازاو خوشکەزاو باپیر و داپیر و زۆری تر لەو پەروەردەکردنەدا بەشدارن، پەیوەندییەکە زیاتر بەهێز دەبێت و زۆربەی هەستونەستەکانی منداڵ دابین دەکات. ئەمە سروشتێکی باشە لە کۆمەڵی کوردەواریدا و دەبێت بەهۆی زیاتر پاراستنی کۆمەڵ و توندوتۆڵکردنی پەیوەندی ئەندامانی خێزان لەگەڵ ئەندامانی بنەماڵەدا.

ئەم پەیوەندییە یارمەتیدەرێکی بەهێزە لەکاتی ڕوودانی کارەساتی جەرگبڕدا بۆ پاراستنی کۆمەڵ بە گشتی و پاراستنی منداڵ لە ئەنجامی ناخۆش و دڵتەزێن بەتایبەتی. لە توژینەوەیەکدا کە(د. عەبدولباقی ئەحمەد) لە ساڵی 1992 لەسەر ئەو خێزانانەی کە دووچاری ڕەوەکەی ساڵی 1991 بووبوون ئەنجامی داوە، بە تەواوەتی دەردەکەوێت کە ئەم پەیوەندیە بەهێزەی خێزان یارمەتی منداڵ دەدات، کە تووشی نەخۆشی(سەرسامی)نەبێت.

لە بێگانە ترسان

کاتێک منداڵ لە تەمەنی (6 – 9 مانگ)ی پەیوەندی خۆی لەگەڵ دایک و دەورووبەریدا بەهێز کردووە، ئەوا پلەیەکی تر لە پەیوەندی دێتە پێشەوە کە ئەویش لە(بێگانە) ترسانە، کاتێک بێگانەیەک خۆی لە منداڵەکە نزیک دەکاتەوە (بێگانە، هەموو کەسێک جگە لە ئەندامانی خێزانەکەی دەگرێتەوە)، ئیتر منداڵەکە دەست دەکات بە زریکاندن و خۆنووساندن بە دایکیەوە و دەست بە گریان دەکات. ئەممەش دەبێتە مایەی سەرسوڕمانی خزم و کەسوکارو دەپرسن بۆ ئەم منداڵە لە بەرامبەر ئەمان لە پڕێکا وای لێهاتووە؟ لەوانەیە ببێتە هۆی دروستبوونی ناخۆشی لەنێوان ئەندامانی خێزانەکە و خزم و کەسوکاری منداڵەکەدا.

ئەم ترسە، نیشانەیەکی خراپ نییە و پلەیەکی تر لە پلەی پێشکەوتنی هەست و بیری منداڵ دەردەخات و نیشانەی ئەوەیە، کە منداڵەکە هەست بە جیاوازی لە نێوان ئەندامانی خێزانەکەی و ئەوانی تردا دەکات، بە مانایەکی تر جیاوازی لە نێوان ئەوانەی لەوەوپێش پەیوەندی لەگەڵ بەستوون و ئەوانەی کە پەیوەندەی لەگەڵ نەبەستوون دەردەخات و سەرەتایەکە بۆ پلەیەکی تر لە پێشکەوتن کە پێی دەوترێت(ترسی جیابوونەوە).

## سەرەتای ترسی جیابوونەوە

لە بەشی دووەمی ساڵی یەکەمدا نیشانەیەکی تری پێشکەوتنی منداڵ بەدیدەکرێت، ئەوەیش ترسی جیابوونەوەیە لە دایک، ئەمە نیشانەیەکی دیارو ڕوون و ئاشکرا دەبێت هەر لەو تەمەنەوە تا تەمەنی دەگاتە (2 – 3) ساڵان. ئەم ترسە بە ئاشکرا لەگەڵ زیادبوونی جموجۆڵی منداڵەکە دەبێنرێت و لەنێوان (7 – 8 مانگیدا) لە نزیک دایکیەوە خۆی خەریک دەکات، دوایی نەختێک دوورتر دەکەوێتە و خێرا دەگەڕێتەوە بۆلای دایکەکە، بۆ ئەوەی پەیوەندی پێوە بکاتەوە و دەست و قاچی دەگرێت ، وردە وردە منداڵەکە دەڕوات و بە هەموو ژوورەکاندا دەگەڕێت، هەرچەندە زوو زوو بۆلای دایکی دێتەوە بۆ پەیوەندیکردن، یا تەماشکردنی بۆ ئەوەی دڵنیابێت، ئەم خۆزگە یان ویستە کە هانی دەدات بۆ ئەوەی بگەڕێت و شتی تازە بپشکنێت لەگەڵ ئەو حەز و خۆزگەیە بەربەرەکانی دەکات کە لە منداڵدا هەیە و دەیەوێت لە نزیک دایکەوە بێت، ئەم بەربەرەکانییە بەردەوام دەبێت، تا وای لێدێت کە منداڵەکە دەتوانێ بۆ ماوەیەک بەبێ دایک لە شوێنێکی دوورتر لەو شوێنەوە کە دایکی لێیە، لە خانووەکەدا بمێنێتەوە و بەبێ ئەوەی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە دایکەوە هەبێت، تەنیا ئەوەندەی بەسە کە گوێی لە دەنگی دایکی بێت.

منداڵ زۆر هەوڵ و تێکۆشانی جیاواز جیاواز دەدات بۆئەوەی لەم ترسە ڕزگاری بێت، وەکو هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی شتی ونبووی ژێر دەستەسڕێک یاخود یاری چاوشارکێ و خۆشاردنەوە، منداڵەکە زۆر دڵی خۆش دەبێت و کاتێ کە یارییەکی بۆ دەخرێتە ژێر دەستەسڕێکەوە و لە پڕێکا دەستەسڕەکە لادەبەیت و یارییەکە دەردەکەوێتەوە، ئیتر منداڵەکە لە خۆشیاندا گەشکە دەیگرێ و پێدەکەنێ. یاخود یاری خۆشاردنەوە لە پشت دەرگاوە بۆ ماوەیەکی یەکجار کورت و هاتنەوە پێشەوە و سەردەرهێنانەوە، یەکجار منداڵەکە دڵخۆش دەکات و بەپێی (شیکردنەوەی دەروونی ) دەرکەوتووە، کە منداڵ بەهۆی ئەمجۆرە یارییانەوە دەتوانێت سەرپشک بێت و نەترسێ لە ونبوونی دایک و تێدەگات لەوەی گەر هەر کاتێکیش کە ونبوو دڵنیابێت لەوەی کە دێتەوە بۆ لای ئەم یاریانە بە مەرجێ زۆر نەخاێنێت و نەبێت بەهۆی ترساندنی، ئەمانە زۆر کەڵکیان بۆ منداڵەکە هەیە.

یارییەکی تری خۆشەویست لای منداڵ لەم تەمەنەدا بەردانەوەی شتە بۆ ئەرز و هەڵگرتنەوەو بەردانەوەیەتی جار لەدوای جار. هەر کە کەوچکێک یان شتێکی تر بەردەدەیتەوە. منداڵ ڕادەوەستێ تا گوێی لە دەنگی دەبێت و لە دوایدا چاو دەگێڕێ بە دوای شتە (ون) بووەکەدا، کە بۆی هەڵدەگریتەوە ئیتر ئەو جارێکی تر بەری دەداتە خوارەوە و دەست دەکات بە پێکەنین.

لەوانەیە ئەمە بۆ دایک شتێکی زەحمەت بێت و تاقەتی نەبێت، بەڵام دەبێت دایک بزانێت، کە منداڵەکەی زۆر شتی ژیرانەی لێوە فێر دەبێت و لەو ڕێیەوە بەسەر ترسی جیابوونەوەدا سەردەکەوێت و باوەڕی بە دایکی زیاتر دەبێت و لەوە تێدەگات کە دایک هەمووکات ئامادەیە لەکاتێکدا پێویستی بە یارمەتی هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە کاتێکی خۆش لەگەڵ یەکدا بەسەر دەبەن.

## پارچە قوماش خواردن

تێکۆشان بۆ جیابوونەوە بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام دەبێت و وردە وردە منداڵ دەست لە دایک بەردەدات، چ وەک لەش و چ وەک هەستونەستەکانیشی دوور دەکەوێتەوە، بەڵام ترس و خەمی جیابوونەوەی هەر دەمێنێت. لەبەرئەوەش کە منداڵەکە دەستی بە ڕۆیشتن کردووە، پێشکەوتنی تر دێتە پێشەوە بەوەی کە منداڵەکە، بەتەنیا و بێ یارمەتی دایکی دەست بە پشکنینی دەورووبەری خۆی دەکات.

منداڵ بە زۆر شێوەی جیاواز ئەم تەنگوچەڵەمەی جیابوونەوەیە چارەسەر دەکات و هەر لە منداڵییەوە ڕێگای تایبەتی خۆی هەیە. لە دوای ساڵی یەکەم، منداڵ بە تەواوەتی خۆ بە پارچە پەڕۆیەک یان بەتانییەک یان یارییەکی نەرم یاخود بووکەشووشەکەوە دەگرێت. کە ئەمانە هەریەک بە شێوەیەک دایکی بیر دەهێننەوە و بە شێوەیەک لە شێوەکان پەیوەندی بەو پەیوەندییەوە هەیە کە لەنێوان دایک و منداڵەکەدا هەیە، ئەو شتەی منداڵەکە لەم قۆناغەدا بەکاری دەهێنێت. پێی دەوترێت(شتی قۆناغی گواستنەوە)و منداڵەکە لەگەڵ خۆیدا دەیبات بۆ هەر کوێ بڕوات و لێی جیانابێتەوە. خۆ ئەگەر هەوڵبدەیت بیشۆیت یان بیگۆڕیت و بەشتێکی تر، ئەوا دەبێت بەهۆی سەرلێشوانی منداڵەکە و تووڕەبوونی و زیانێکی زۆری لێدەدەیت. ئەم پارچە قوماشە یارمەتی منداڵەکە دەدات بۆ جیابوونەوە لە دایک و بوون بە مرۆڤێکی سەربەست و لەم کارەیدا پێویستی بە شتێک هەیە ئەو ترسەی خۆی پێ دەربڕێت و ترسەکەی بخاتە سەر ئەو شتە و منداڵ دەتوانێ پارچە قوماشێک لەجیاتی دایکی بۆن بکات، هەروەها لەم قۆناغەدا منداڵەکە دەیەوێت دایکی لەگەڵیدا بنوێت و دەست بەپشتیدا بهێنێت و ئەمەیش بەوە دەردەبڕێت، کە توند کراسەکەی دایکی دەگرێت یان بۆنی دەست و بنباڵ و قژی بکات یاخود داوای گۆرانی یان خوێندنەوەی پەرتووکێک لە دایکی بکات، ئەمانەش هەموویان ترسی منداڵەکە دەردەخەن بەرانبەر بەوەی دایکی لە دەست نەچێت. یارمەتیی دایک ، بۆئەوەی مناڵ بەسەر تەنگوچەڵەمە و ناخۆشی ئەم قۆناغەدا سەرکەوێت زۆر گرنگە بۆئەوەی منداڵ کەسێکی وای لێدەربچێت، کە متمانەی بەخۆی بێت و نەترسێت.

زۆرجار دایکوباوک تووشی نارەحەتییەکی زۆر دەبن بەوەی کە منداڵەکەیان لە ژووری خۆی بەجێدەهێڵن پێش ئەوەی خەوی لێ بکەوێت، لەم کاتەدا منداڵەکە بە ئاگا دێتەوە و دەست بە گریان دەکات و ئەوسا دایکوباوک جارێکی تر دەست پێدەکەنەوە و ئەمجارەیان زۆرتری پێدەچێت تا منداڵەکە خەوی لێدەکەوێتەوە. بەهەمانشێوە منداڵەکە بە ئاگادێتەوە و زیاتر دەگری، ئەمە لە وانەیە چەند جارێک دووبارە ببێتەوە و دایک تەواو هیلاک دەبێت و تووشی تووڕەبوون و سەر ئێشەش دێن. ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە منداڵەکە هەستی بەوە کردووە کە دایکی بە جێی دێڵێ و ترسی جیابوونەوەی هەیە، ئیتر ناوێرێ بنوێت و خەوی ئەزڕێ و کاتێکیش کە دایکەکە دەڕوات ترسی منالەکە ڕاست دەردەچێت و زیاتر وریا دەبێتەوە و داواکانی زیاتر دەبێت بۆئەوەی دایکەکە لای خۆی زیاتر بهێڵێتەوە. هەروەها ئەمە پەیوەندی بە میکانیزمی خەوەوە هەیە، گەر منداڵ لەکاتی خۆیدا خەوی لێ نەکەوت، ئیتر دەبێت چاوەڕوانی شەپۆلی دووەمی خەو بێت کە لە وانەیە چەند کاتژمێرێک بخایەنێت.

تەنها چارەسەرێک بۆ ئەمە ئەوەیە کە دایک بە تەواوەتی بڕیاری خۆی بدات و خۆی بۆ ئەوە ئامادە بکات، هەموو شەوەکە و تانەنەت چەند شەوێکیش بۆ دڵنیاکردنەوە لەگەڵ منداڵەکەیدا بنوێت ئینجا بگەڕێتەوە سەر باری جاران و لەگەڵ منداڵەکەیدا بمێنتەوە تا خەوی لێدەکەوێت.

لە کوردەواری خۆماندا، منداڵ هەر لەگەڵ خێزان، لە باوەشی دایکدا، لەبەرامبەر تەلەفزیۆن دادەنیشێت، تا خەوی لێ دەکەوێت دوای ئەوەش هەر لەسەر جێگای خۆیان و لەهەمان ژووردا دەخەون.

ئەمە پەیوەندی بە کلتووری گەلان و باری ئابووری و ڕامیاری ئەو گەلانەوە هەیە، خۆ ئەگەر خێزان تەنها ژوورێکی بۆ هەموو ئەندامانی خێزانەکە هەبێت، ئەوە پێویست بە گفتوگۆ ناکات و چار نییە و زۆر لە گەلانی جیهان، بەتایبەتی گەلانی جیهانی سێیەم ، منداڵ بە درێژایی ڕۆژ لەگەڵ دایکوباوکیدایە، بێگومان ئەمەش چاکە و خراپەی خۆی هەیە، بەڵام ئەگەر دایک ڕەحمێک بە خۆی بکات و لەکاتی نووستندا لە منالەکەی دووردەکەوێتەوە، ئەوا بۆ هەردوولا باشە و دایکەکەیش پشوویەک دەدات، لەم کاتەدا وا باشە کە منداڵەکە دوای ئەوەی کە خەوی لێ کەوت، لە شوێنێکی دوور لە قەرەباڵغی دابنرێت و لە دەنگی لەپڕ و هاوار و دەنگەدەنگی تەلەفزیۆنەکە دووربخرێتەوە تا کار نەکاتە سەر خەوی منداڵەکە و تووشی خەوی ناخۆش نەبێت و لە پڕێکا خەبەری نەبێتەوە و بترسێ .و تووشی ناخۆشی ببێت

گەشەکردنی مێشک

منداڵ هەرکە لەدایک دەبێت، لەگەڵ خۆیدا چەند خویەکی هێناوە بۆئەوەی بتوانێ لە دەرەوەی سکی دایکیدا بژی و ژیانی سادەی منداڵ بەم خوانە بەڕێوە دەڕوات وەک (مژین، گرتن..) بەهۆی ئەم خوانەوەیە منداڵ فێری چەند چالاکییەک دەبێت و توانای بۆ کۆکردنەوەی .زانیاری وردە وردە باشتر دەبێت، بەڵام دنیای منداڵ زۆر لەوە جیاوازترە، کە دەورووپشتی تێی دەگەن

لەنێوان تەمەنی(1–4) مانگیدا منداڵ فێری ئەوە دەبێت ئەم خوانە پێکەوە بگونجێنێت، وەکو خوی (مژین و گرتن بەیەکەوە ) یان .((گوێگرتن و تەماشاکردن بەیەکەوە

لە (4 – 8) مانگیدا منداڵ ئەو جوولانەوانەی لەخۆیانەوە ڕوودەدەن، دووبارە دەکاتەوە و لە مێشکی خۆیدا تۆماریان دەکات. وەکو ئەوەی گەر شەقشەقەیەک بجوولێنیتەوە ، دەنگێکی تایبەتی لێوە دێت و خۆشییەک بە منالەکە دەبەخشێت و پاش ماوەیەک منداڵەکە فێری ئەو دەنگە دەبێت و ئیتر پێویستی بەوە نامێنێت ئیعتماد بکاتە سەر خوەکان و خۆی هەوڵدەداتڤ، ئەوکاتەی کە خۆی دەیەوێت شەقشەقەکە ڕاوەشێنێت. لە تەمەنی(8 – 12) مانگیدا ئیتر چالاکی منداڵ زیاتر ڕەزامەندی منداڵەکە خۆی لەسەرەو زانیاری زیاتر لەسەر شتەکانی دەورووپشتی پەیداکردووە، وەک (یاری سەر جێگاکەی و پشتی و لێفەکەی خۆی) یان پەیوەندی ژوورەکانی ماڵەکە بەیەکەوە، وەک:(موبەق و ژووری نووستن و ئەو دەنگانەی لێوەیان دێت). بێ لەوەیش فێر بووە کە یەک شت، لەهەمانکاتدا لەدوو شوێندا نابێت، یان دارێکی چوارگۆشە لەگەڵ کونێکی سێگۆشەدا ناگونجێت. ئەم شتانەیش بەوە فێر دەبێت کە دووبارەیان بکاتەوەو .هەڵە بکات و هەمدیسان هەوڵ بداتەوە دووبارەیان بکاتەوە

لە تەمەنی(8) مانگیدا ڕووداوێکی گرنگ لە ژیانی منداڵ ڕوودەدات، ئەویش ئەوەیە، کە تا ئەوکاتە منداڵ وا دەزانێت، کە شتێک لەبەرچاو ونبوو، ئیتر نەماوەو نادۆزرێتەوە، بەڵام ئێستا لەمەیش تێدەگات ، بۆ نموونە ئەگەر یارییەک بخەیتە بەردەمی منداڵێکی تەمەن(6) مانگان خۆی بۆ ئەکێشێ و دەیەوێت بیگرێت، بەڵام ئەگەر پارچە پەڕۆیەکی پێدا بدەیت، ئیتر ڕووی خۆی بۆ لایەکی تر وەردەگێڕێ و هەوڵی بۆ نادات، چونکە وا دەزانێ کە یارییەکە نەماوە، بەڵام لە (8) مانگیدا منداڵەکە فێری ئەوە دەبێت، کە هەرچەندە یارییەکە دیار نییە بەڵام ماوەو هەوڵدەدات پەڕۆکە لەسەری لابدات و بیدۆزێتەوە، ئێستا ئەگەر یارییەکە لەژێر پارچە قوماشەکە لاببەین

بیخەینە ژێر پشتیەکەوە، کاتێک منداڵەکە سەیری دەکات ئەوا هەر دەچێتەوە سەر پارچە قوماشەکە و هەوڵ نادات لەژێر پشتییەکەدا بەدوای یارییەکەدا بگەڕێت، چونکە ماوەیەکی تری دەوێت تا منداڵ فێری ئەوە دەبێت.

ئەم پێشکەوتنە لەسەرخۆیەی منداڵ، کە بتوانێت وێنەی شتومەک لە مێشکی خۆیدا بهێڵێتەوە، زۆر گرنگە، کاتێک کە منداڵ تەمەنی بە مانایەکی تر، (OBJEKTKONSTANS) دەگاتە 2 ساڵان پێشکەوتنێکی تەواوی لەمڕووە کردووە ، کە پێی دەوترێ (بوونی شت هەرچەندە شتێک یان کەسێک لەبەرچاو نەبێت و نەبینرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر هەیە، ڕاستتر منداڵەکە لەم تەمەنەدا دەتوانێت وێنەی شتومەک لە مێشکی خۆیدا تۆمار بکات و بیهێڵێتەوە.

ئەم دیاردەیە گرنگە لێی تێ بگەین، بۆ ئەوەی بزانین پێش تەمەنی دوو ساڵان، کاتێک منداڵ بە تەنیا جێدەهێڵرێت، ناڕەحەت دەبێت، چونکە لەو تەمەنەدا منداڵ دڵنیا نییە لەوەی کاتێک دایک بەجێی دەهێڵێت و دیار نامێنێت، هەیە یان نییە، ئەمەیش دەبێت بەهۆی ناڕەحەتی منداڵەکە لەبارێکی وادا، هیچ فێڵ و قسەکردن و تووڕەبوونێک سوودی نییە و پێویست ناکات منداڵەکە ئازار بدرێت، چونکە منداڵ لەم تەمەنەدا پێویستی بە یەکێک هەیە کە بە درێژایی شەو و ڕۆژ لەگەڵیدا بێت، تەنیا بە ڕاهێنانێکی زۆر، دایک دەتوانێت منالەکەی وا لێ بکات کە بێ ترس بۆ ماوەیەکی زۆر بەجێی بهێڵێت، ئەمەش باسێکی ترە.

بناغەی بڕوا

شتێک کە لەم تەمەنەدا بناغەی لە دەروونی منداڵدا داکوتابێت ئەوەیە کە فێر دەبێت تا چ ڕاددەیەک بڕوا بە دەورووبەرەکەی خۆی بکات، ئەگەر دایک و باوک، لەم ماوەیەدا جێی بڕوای منالەکە بووبن، بەوەی کە هەمیشە لە کاتی پێویستی منداڵەکەدا پێویستییەکانیان بۆ جێبەجێ کردبێ، وەک: (خواردن، چاودێری، یاری..) ئەوا منداڵەکە ، دەزانێت کە دەتوانێت بڕوایان پێ بکات، ئەم هەستە وا لە منداڵەکە دەکات کە ڕووخۆش و تەندروستی باش و گوێڕایەڵ بێت، بۆ پەیوەندی لە نێوانیانداو بە پۆزەتیڤ سەیری ژیان بکات.

منداڵێک کە ئەم بناغەیەی نەبێت و لەم تەمەنەدا خۆشەویستی پێ نەدرابێ، هیچ کاتێک ناتوانێ ئەم بڕوایە لەخۆیدا پەرە پێبدات و هەردەم گومان لە دەوروویشتەکەی دەکات و بە چاوێکی ڕەشبینانە تەماشای ژیان دەکات.

لێرەدا دەبێت ئەوە بڵێین کە خۆشەویستی مانای ئەوە نییە، منداڵ چی ویست بیدرێتێ و چ داخوازییەکی بوو بۆی بکەیت، چونکە جیاوازی هەیە لەنێوان ئامادەکردنی پێویستییەکانی منداڵ و بەخێوکردنی منداڵدا.

تێپەڕبوونی ماوەیەک بەسەر ئامادەکردنی شیر بۆ منداڵ، لەکاتی شیرخواردندا، نەک تەنها باشە، بەڵکو پێویستیشە، بۆئەوەی منداڵ ) فێری چاوەڕوانی ببێت و وا نەزانێت کە هەردەمی کردووە دەبێت خواردنەکەی بخرێتە بەردەم) یان کاتێک کە چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە لە جێگاکەی بەرزی بکەیتەوە، ئەم چاوەڕوانییە لە ژیاندا زۆرجار دووپات دەبێتەوەو زۆرجار ژیان بریتییە لە چاوەڕوانی.

ئەم دیاردەی چاوەڕوانی نەکردنە بە تەواوەتی لە هاوڵاتیانی ڕۆژهەڵاتیدا، کاتێ کە لە ئەوروپا دەژین، دەردەکەوێت، بۆ نموونە، مرۆڤی ڕۆژهەڵاتی ناتوانێ چاوەڕوان بێت و دان بەخۆدا بگرێت، کاتێک دەچێتە ڕیزێکەوە، هەر زوو لە ڕیزەکەدا سەبری نامێنێت و دەکەوێتە ملەقوتێ و زۆرجاریش خۆی تووشی تەنگوچەڵەمە دەکات، بەوەی کە هەوڵدەدات ڕیزەکە تێک بدات و فێڵ بکات و پێش ئەوانی تر بکەوێت.

زۆرجار دایک و باوک بەپەلە و پێش وەخت شیر بۆ منداڵ ئامادە دەکەن، بێ ئەوەی هیچ جۆرە نیشانەیەک لە منداڵەکەدا دەرکەوتبێت ، بەوەی کە برسییەتی یاخود گریابێت، ئەم کارە زیانێکی زۆر لە منداڵ دەدات و لە دوارۆژیشدا دەبێت بەهۆی خووڵقاندنی ئاژاوە لە مابەینی دایک و منداڵدا،(زۆرمان تا ئێستاش کە برسیمان بوو ئیترچاومان بەرپێی خۆمان نابینێت) هۆی ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەم تەمەنەدا فێری چاوەڕوانی نەکراوین و بەر لەوەی پێویستییەکمان بووبێت بۆمان ئامادەکراوە.

کاتێ ئامادەکردنی پێویستییەکانی منداڵ ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت و پێویستییەکانی جێبەجێ ناکرێن، منداڵ بڕوای بە دایک و باوکی کز دەبێت یان نامێنێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئەوە بزانین کە کات لای منداڵ و گەورە وەک یەک نییە، بۆیە دەبێت دایک و باوک خۆیان بزانن کەی وەختی جێبەجێکردنی پێویستییەکانی منداڵەکەیانە، لێرەدا گرنگترین شت ئەوەیە کە دایک و باوک دەستپێشخەری نەکەن و لەخۆیانەوە بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەک لە منداڵەکەدا دەرکەوتبێت ، یارمەتی منداڵەکە بدەن و پێش ئەوەی منداڵەکە نیشان بدات کە پێویستی بە یارمەتییە. ئەمە نەک تەنیا لەم تەمەنەدا بگرە لە هەموو ژیانی منداڵدا و لەهەموو باروودۆخێکدا گرنگە و دایک و باوک دەبێت خۆیان دوورەپەرێز بگرن و دەست نەخەنە کاری منداڵەکەوە تا بەخۆی داوای یارمەتییان لێ نەکات.

هەروەها چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵ ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت بۆ ئەوەی بڕوا بە دایک و باوکی بکات. ئایا بە ڕوویەکی خۆش و بە ڕەزامەندییەوە یاخود بە لالووتی و نابەدڵییەوە کارەکەی بۆ ئەنجام دەدەن، ئەمانە هەموو کار دەکەنە سەر پێشکەوتنی مێشک و دەروونی منداڵ و بەوە ڕادێت بە چ چاوێک سەیری ژیان بکات، ڕووناکبین بێت یان ڕەشبین.

سەرەتای زمان فێربوون

ژیانی منداڵی ژیانێکە زمان و قسەکردن هێشتا تێیدا نەبوونەتە کەرەسەی دەربڕین، بەڵام دایک و باوک دەتوانن یاری هەمەجۆر لەگەڵ منداڵدا بکەن، کە دەبێت بەهۆی پێشکەوتنی زمان و هاندەری قسەکردن وەک کەرەسەیەکی دەربڕین.

دایکان(جاری جاران) کاتێ بە ئیشوکاری ناو ماڵەوە خەریکبوون گۆرانی یان قسەیان لەگەڵ منداڵەکەیاندا دەکرد، بەمە نیشانەیەکی گرنگیان بە منداڵەکەیان دەدا، کە دەنگ ئامێرێکی گرنگی پەیوەندییە لە نێوانی خەڵکیدا. لەماوەی دوو مانگی یەکەمدا، منداڵ زۆرجار گڕوگاڵ دەکات، کە لە دەنگەکانی زمان دەچن. لە شەش مانگیدا، منداڵ دەتوانێت چەند دەنگێک دەربڕێ، وەک:
(ما....ما...با....با....دا....دا...) کەوا لە دایک و باوک دەکات کە پێیان وابێت منداڵەکەیان ناویان دەبات و دەیانناسێتەوە، ئەمەش وا دێتە بەرچاو کە هەموو گەلانی جیهان بۆ ناوی دایک و باوک، وشەی وایان هەڵبژاردبێت کە منداڵ بتوانێت بە ئاسانی دەریان ببڕێت. لە دەورووبەری نۆ مانگیدا ئەو دەنگانەی کە لە منداڵەوە دێنە دەرەوە لە دەنگەکانی زمانی دایک و باوک دەچن، لە یەک ساڵیدا ئەمە بە تەواوی دەردەکەوێت.

لاسایکردنەوە کارێکی گرنگ دەکاتە سەر پێشکەوتنی زمانی منداڵ، زۆر دایک و باوک لاسایی منداڵەکەیان دەکەنەوە و منداڵەکەش لاسایی دایک و باوکی دەکاتەوە. یارییەکە فێربوونی زمان ئاسان دەکات و پێشی دەخات، ئەوەیە کە پرسیار بکەیت کە شتوومەکی دەورووبەری منداڵەکە ناویان چییە، منداڵەکەش دەست بۆ شتەکان ڕادەکێشێت و سەیرێکی پرسیارکەر دەکات و ئەویش پێی دەڵێت کە شتەکە ناوی چییە.

یاخود یاری لەگەڵ منداڵەکەتدا دەکەیت بەوەی کە پرسیاری لێدەکەیت، کوانێ (گوێچکەت، چاوت و دەمت..) ئەمە دەبێت بە یاری کە منداڵەکە بەهۆیەوە لەشی خۆی دەپشکنێ و زمانیش باشتر فێر دەبێت، ئەم یاریانە پێویستە زۆر گرنگیان پێ بدرێ، چونکە جگە لەوەی کە پەیوەندی کۆمەڵایەتی زیاد دەکات و منداڵەکە لە فێربوونی زماندا پێش دەکەوێت و لەشی خۆی و دەورووپشتی دەپشکنێ، منداڵ فێری ئەوەش دەکات کە شتومەک ناوی هەیە، ئەمە پشکنینێکی گرنگە بۆ منداڵ کە دەتوانێت بەهۆی ناوەوە شتومەک، بۆ بەشی جیاواز جیاواز دابەش بکات، ئەمەش لەدوایدا باسی دەکەین، کە خاڵێکی زۆر گرنگە بۆ گەشەسەندنی مێشکی منداڵ.

کاتێ منداڵ زیاتر پێشکەوت و دەستی بە ڕۆیشتن کرد، پێش ئەوەی قسەبکات، دەیەوێت پەیوەندی بە دەورووبەرەکەیەوە بکات، بۆ ئەمەش هەوڵدەدات لە دەورووبەرەکەی بگەیەنێت کەچی دەوێت، لەوانەیە، جلەکانی یاخود پێڵاوەکانی بهێنێتە پێشەوە، بۆ ئەوەی پێت بڵێت کە دەیەوێت بچێتە دەرەوە، یاخود پەرتوکێک دەهێنێ، بۆ ئەوەی پێت بڵێت کە حەزی لە حیکایەتە و دەیەوێت حکایەتێکی بۆ بخوێنێتەوە، هەرچەندە لەم کاتەدا منداڵ ناتوانێت قسە بکات، بەڵام هەر لە ئێستاوە هەوڵدەدات بۆ فێربوونی زمان، لێرەدا هەڵسوکەوت و مامەڵەی دەورووبەر، بەتایبەت دایک و باوک، بەرانبەر منداڵەکە کارێکی گرنگ دەکاتە سەر منداڵەکە و یارمەتی دەدات بۆ فێربوون.

بەشێوەیەکی گشتی منداڵ تا دوای ساڵی یەکەم، بە تەواوەتی ڕستە بەکارناهێنێ، و کاتی بەکارهێنانی دوو وشە و دروستکردنی ڕستە لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر جیاوازی هەیە و زۆرجار دایک و باوک بە خۆڕایی خۆیان سەغڵەت دەکەن کە منداڵەکەیان دوو ساڵیشە و قسە نازانێ، ئەمە لەکاتێکدا کە جاری وا هەیە منداڵ تا سێ ساڵیش فێری قسە نابێت، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە منداڵەکەت زانیاری تەواو یان کەرەسەیەکی تەواوی بۆ قسەکردن پێ نییە، بەڵکو ئەوەندەیە کە جارێ نایەوێ قسە بکات، کاتێک کە ئەو زانیاری و کەرەسە کۆکراوانەیشی کرد بە قسە ئەوە بەجارێ هەمووی ئەڕژێتە خوارەوە.

هەنگاوی یەکەم

کاتێک منداڵ گەورە دەبێت و جموجۆڵی زیاد دەکات و دەتوانێت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بڕوات، مێشک و هەستیشی پێشدەکەوێت، لە دەورووبەری تەمەنی 8 مانگی و لە نێوانی 8 تا 12 مانگیدا ، منداڵ ئەگەر یارمەتی هەبێت و بتوانێت دەست بگرێت بە شتەوە، خۆی بەرز دەکاتەوە، بەڵام بە تەواوەتی ناتوانێ دانیشێتەوە، ئەمە وای لێدەکات بترسێ و بزریکێنێ، بەڵام زۆر ناخایەنێ کە ئەمەش فێردەبێت و دەتوانێت دەست لە کورسییەکە بەردات و بەسەر قاچەکانیدا بکەوێتەوە سەر زەوییەکە، کە ئەمە زۆرجار نایەشێت و ترسێکی ئەوتۆی نییە.

لە دەوروبەری تەمەنی 9 تا 16 مانگیدا منداڵەکە دەتوانێت بەبێ یارمەتی بە پێوە بوەستێ . هەرئەوەندە دەزانی، کە ڕۆژی لە ڕۆژان منداڵەکە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بە پێوە ڕاوەستاوەو دەستەکانی بەرز دەکاتەوە بۆئەوەی پارسەنگی خۆی ڕابگرێت، تەماشای .دەورووبەرەکەی دەکات و ئەتریقێتەوە و هەوڵدەدات چەند هەنگاوێک بۆ پێشەوە بڕوات. بەمە قۆناغی یەکەمی ژیان تەواو دەبێت

هەندێ تەنگوچەڵەمەی ئەم قۆناغە

لێرەدا باسی هەندێ تەنگوچەڵەمەی گرنگ دەکەین، کە زۆرجار کارێکی زۆر گەورە دەکاتە سەر ژیانی هەموو خێزانەکە بەگشتی و پەیوەندی نێوانی دایک و منداڵەکە بەتایبەتی بەجۆرێک کە دایک تووشی ناخۆشی و ئازار دەبێت و منداڵەکەیش هەستی پێدەکات و لە .دوودڵی دایکەکە ئاگادار دەبێت و دەبێت بە هۆی نارەحەتی منداڵەکە

.............................لەشیربڕینەوە....................

لەشیربڕینەوە یەکێکە لەو هەنگاوە گەورانەی کە دەبێت لە ژیانی منداڵی ساوادا بنرێت، بۆئەوەی وردە وردە منداڵەکە خۆی لە دایکی جیابکاتەوە و خۆی بتوانێ وەکو مرۆڤێکی سەربەست و خۆی خواردن بخوات.

دەزانین کە مەمکدان بە منداڵ (یاخود شیری شووشە) یەکەم کاری هاوبەشە لەنێوانی دایکومنداڵدا و یەکێکە لەو شتە تایبەتییانەی کە تەنها دایکومنداڵ بەشداری تێدا دەکەن. لەبەرئەوەی کە لە شیر بڕینەوە مانای ئەوەیە کە دەستبەرداری یەکتری دەبن، لەوانەیە نە دایکەکە نە منداڵەکە ئەمەیان نەوێت و زۆر منداڵ لە جیاتی مەمک مژین یاخود شووشەی شیرەکە دەست دەکات بە پەنجە مژین یاخود مەمکە مژە کە ئەمە شتێکی ئاساییە و ترسی نییە.

بۆئەوەی کە ئەم گۆڕانە لە قۆناغی شیر خواردنەوە بۆ قۆناغی نانخواردن ئاسانتر بێت، هەندێ لە دایکان شەوان شووشەیەک دەدەن بە منداڵەکە و منداڵەکە وای لێ دێ کە فێری شووشە ببێت لەکاتی نووستنیشدا و ئەمە دەبێت بە نیشانەیەک بۆ دایکەکە و جێگای ئەو دەگرێتەوە، ئەمە شتێکی خراپ نییەو شووشەکە دەبێت بە شتێک بۆماوەی گواستنەوە بۆ منداڵەکە، لە ترسی جیابوونەوەی منالەکە کەم دەکاتەوە، لەبەرئەوە دەبێت دایک ئاسایی بێت بەلایەوە و سەری سووڕ نەمێنێ کە منداڵ تا دوای تەمەنی یەکساڵانیش داوای شووشەکەی بکات.

لە شیربڕینەوەی منداڵ ئەمەندە تەنگوچەڵەمەیەکی گەورەیە بۆ دایکان لەلای ئێمە کە زۆرجار کارێکی زۆر خراپ دەکەن، بەوەی شتی تاڵ و تیژ لە گۆی مەمکی خۆیان هەڵئەسوون، وەکو بیبەر و خوێ و شتی تاڵ بۆ ئەوەی منداڵەکە بترسێنن و وای لێ بکەن کە لە شیری ببڕنەوە. بۆئەوەی بە شێوەیەکی ڕاست و دروست مامەڵە بکەین، کە چۆن منداڵ لە شیر دەبڕێتەوە، ئەوا بەگشتی ئەو خاڵانەی کە پێویستە چاودێری بکرێن، باس دەکەین و دایک خۆی بەپێی باروذۆخی خێزان دەتوانێت شتە ناسەرەکییەکانی تر جێبەجێ بکات.

1- لەشیربڕینەوە دەبێت وردە وردە و لەسەرخۆ بێت، نەک لەپڕ ئەگینا منداڵەکە دەترسێنێت

2- هەر لە تەمەنی 2- 3 مانگیەوە ڕێ بە منداڵ بدرێت تامی ئەو خواردنانە بکات کە خێزان دەیانخوات ، وەکو شۆرباو شلەمەنی (لێرەدا دەبێت ئەوە بڵێین کە لە ساڵی یەکەمدا نابێت شتی سوێر بدرێت بە منداڵ) بۆئەوەی لەکاتی لە شیربڕینەوەدا ئەم خواردنە تازانە نەبن بە مایەی سەرسوڕمانی منداڵەکە، زۆر منداڵ ئەگەر یارمەتی بدرێت، دەتوانێت لە تەمەنی 6 مانگیدا لە پەرداخێکدا شت بخوات.

3- ئەو دایکەی کە شیری خۆی دەدات بە منداڵ دەتوانێت لە تەمەنی 2 – 4 مانگیەوە، تۆزێک خواردن بدات بە منداڵەکەی وەکو خۆئامادەکردنێک بۆ لە شیربڕینەوە.

4- کاتێ کە خواردن بە منداڵ دەدرێت لەکاتێکدا بیدرێتێ کە زۆر برسی نییە یاخود نەختێ شیری مەمک بدرێت بە منداڵەکە و ئینجا وازی لێ بهێنرێت نانەکەی بخوات، چونکە لەوانەیە لەکاتێکدا کە زۆر برسییەتی سەری لێ بشوێت و کاتی ئەوەی نەبێت شتی تازە تاقی بکاتەوە، بەڵام کاتێ کە برسێتییەکەی دادەمرکێتەوە، بەلایەوە خۆشە شتی تازە تاقیبکاتەوە.

5- لە کاتی هیلاکی و سەر لێشواویدا منداڵ دەگەڕێتەوە سەر مەمکی دایک، چونکە مەمکی دایک سوکنایی دەروونیی بە منداڵەکە دەبەخشێت و خۆی بە سەرپشک دەزانێت، لەم کاتەدا دەبێت دایک زۆر لە منداڵەکەی نەکات، چونکە کە تەندروستی منداڵەکە باشتر بوو ، خۆی دەگەڕێتەوە سەر نانخواردن.

6- لە شیر بڕینەوە دەبێت لەو تەمەنەدا نەبێت کە منداڵ (ترسی جیابوونەوەی) هەیە، چونکە ئەم ترسە و لە شیربڕینەوە بەیەکەوە دەبێت بە شتێکی قورس و گران بۆ منداڵەکە و ناتوانێت بەسەر هەردووکیاندا زاڵ بێت.

لەناو زۆر لە گەلانی کۆندا دایک تا تەمەنی سێ ساڵیش شیری داوە بە منداڵەکەی، ئەمەش چەند هۆیەکی تایبەتی هەبووە، یەکێک لەم هۆکارانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دایکەکە نەیویستووە، منداڵی تری ببێت و ئەمەی بۆ سکپڕنەبوونەوە بەکارهێناوە، یاخود نەیویستووە لە منداڵەکەی جیابێتەوە وترسی لە دەستچوونی منداڵەکەی هەبووە یان لەبەر هۆی ئابووری و نەبوونی خواردن و هۆی تری تایبەتی

پەنجە مژین -2

زۆر دایک و باوک خۆیان سەغڵەت دەکەن بەوەی کە منداڵەکەیان پەنجەی خۆی دەمژێ، پەنجە مژین، کردەوەیەکی سەرەکییە کە مرۆڤ هەر لەکاتی لەدایکبوونەوە دەیکات و بۆمانەوەی منداڵیش پێویستە و مانایەکی قووڵ بە منداڵ دەدات و ئەوە دەردەخات کە .منداڵەکە لە نەشونمادایە

زۆر منداڵ لەبەرئەوەی لە تەمەنی شیرخواردندا بە تەواوەتی شیریان نەخواردووە، یان لەکاتی شیر بڕینەوەدایە، دەست دەکەن بە پەنجە مژین یان مژینی پارچە پەڕۆیەک یان مەمکەمژە. ئەمەیش منداڵ هێمن و لەسەرخۆ دەکات و لەوکاتەدا ترسی جیابوونەوەی زیاترە. منداڵ کاتێک پەنجەی دەمژێ، دەکەوێتە دنیایەکی تایبەتی پڕ لە خەون و خەیاڵەوە و ئەم کارە وای لێدەکات پەردەیەک لەنێوان خۆی و دەورووبەرەکەیدا دروست بکات و خۆی جیابکاتەوە ئاسانتر خەوی لێ بکەوێت.

پەنجە مژین خویەکی نائاسیی نییە، لەبەرئەوە دەبێت دایک و باوک هەوڵبدەن زۆر گرنگی پێ نەدەن و بە لایانەوە سەیر نەبێت و زۆر لە منداڵەکە نەکەن واز لەم خوە بهێنێت، چونکە هیچ زیانێکی بۆ منداڵ نییەو بەرە بەرە خۆی وازی لێدەهێنێت.

## 3- پەروەردەو سنووردانان

منداڵی ساوا نازانێت چاوەڕوانی چییە و ناتوانێت چاوەڕوان بێت کاتێکیش کە دەگری، خواردن و گۆڕین و پێویستییەکانی تری بۆ ئامادە دەکرێت و یاری لەگەڵدا دەکرێت، بەبێ ئەوەی خۆی هیچ ئەرکێک بکێشێت، هەروەها نازانێت کاتێ کە دەگری چی ڕوودەدات و چی بۆ دەکرێت و بۆچی پێویستییەکانی بۆ ئامادە دەکرێت، چونکە توانای ئەوەی نییە ئەم ڕووداوانە هەڵبسەنگێنێت کە لە دەورووبەرەکەیدا ڕوودەدەن، لەبەرئەوە هەر سنووردانان و ئاگادارکردنەوەیەک دەبێت لە ئێستاوە بناغەی بۆ دابڕێژێت.

کاتێ کە منداڵ دڵسۆزانە و باش پەروەردە دەکرێت و پێویستییەکانی لەکاتی خۆیدا بۆ جێبەجێ دەکرێت و فێری چاوەڕوانی دەکرێت، ئەوکات منداڵ بڕوا بە خۆی دەکات و دایک و باوکی دەبنە جێی متمانەیی و فێری لەسەرخۆیی دەبێت و لە دواڕۆژیشدا ئاسانتر دەتوانێت پشت بەخۆی ببەستێت و دان بەخۆیدا بگرێت و تێبگات لەوەی کە مەحاڵە هەموو پێویستییەکانی لەکاتی خۆیدا بتوانرێت جێبەجێ بکرێت.

دانانی سنوور، هەر لە سەرەتاوە بۆ منداڵ باشەو دەیپارێزێ لە کارەساتی ناخۆش و ترسناک ، بۆیە دەبێت دایک و باوک ڕوون و ئاشکرا ئەو سنوورانە لە منداڵ تێبگەیەنن و ڕێ نەدەن ئەو سنوورانە بشکێنێت. بەڵام هیچ کات نابێت ئاگادارکردنەوە و ڕێنیشاندانی منداڵ بگاتە ئەو ڕاددەیەی کە دەست لە منداڵ بەرز بکرێتەوە و لێی بدرێت و دەسەڵاتی بەسەردا بسەپێنرێت.(منداڵ لەکاتی ئاگادارکردنەوەو ڕێنیشانداندا دەتوانێت ڕووی  دایک و باوک بخوێنێتەوەو ئەمەیش بەسە بۆ ئەوەی ناڕەزایی بە منداڵ پیشان بدرێت کاتێک کە کارێکی خراپ دەکات).

## 4- منداڵ و نووستن

زۆربەی منداڵ لە ماوەی تەمەنی 2 – 3 مانگی یەکەمدا جۆرە گریانێکیان لەگەڵ دایە، کە پێی دەوترێت (کولیک). ئەمجۆرە گریانە هەندێکجار دوای سێ مانگ بەسەر دەچێت و هەندێجاریش تا دەورووبەری شەش مانگ دەخایەنێت. لەم حاڵەتەدا، منداڵ گرنگییەکی زۆری پێدەدرێت و دایک و باوک ناچار دەبن کە زۆربەی کات لە باوەشی بگرن و بیلاوێننەوە و شەونخونی بە دیارەوە بکێشن. تا ئەوکاتەی منداڵ وای لێدێت بەبێ باوەش نەنوێت، زۆر ئازاری دایک و باوک دەدات و ناڕەحەتیان دەکات منداڵ لەم حاڵەتەدا، وای لێدێت کە بەدرێژایی شەو بەخەبەر بێت و بێجگە لەوەیش ڕۆژیشی لێ تێکدەچێت و تەندروستی خراپ دەبێت، بێ لەوەیش گرینۆک و کرۆز دەبێت و ناتوانێت بەشێوەیەکی ڕێکوپێک نان بخوات، ئەمەیش کار دەکاتە سەردایک و باوک و تەندروستیان خراپ دەبێت و بە ئاسانی تووڕە دەبن و ناتوانن وەک پێویست گرنگی بە منداڵەکە بدەن.

ئەمە زۆر بە ئاسانی دەتوانرێت چارەسەر بکرێت، ئەگەر دایک و باوک بتوانن دان بە خۆیاندا بگرن، ئەویش بەوەی هەرکە کاتی نووستنی منداڵەکە هات، ئیتر ببرێتە ژووری خۆی و شەوباشی لێ بکرێت و بەجێ بهێلرێت، لەسەرەتادا، منداڵ دەست بە گریان دەکات و دوورنییە هەندێجار بۆ ماوەی کاتژمێرێک بگرە زیاتریش بگری، بەڵام دەبێت دایک و باوک دان بەخۆیاندا بگرن و لێگەڕێن تا منداڵەکە خەوی لێدەکەوێت، ئەنجامی ئەم کارە ، کاتێک دەردەکەوێت کە چەند شەوێک هەمان مامەڵە لەگەڵ منداڵەکەدا بکرێت، تا ئەوکاتەی کە منداڵەکە دەگەڕێتەوە بۆ باری ئاسایی خۆی. بەڵام وەکو وتمان ئەمە کارێکی ئاسان نییە و زۆربەی دایکان وا دەزانن کە منداڵەکەیان گریا ئیتر دەبێت ڕاکەن بەلایدا و خێرا بیگرنە باوەش یان وا دەزانن کە ئێستا منداڵەکە خەریکە بخنکێ و لە لیک و چڵمی خۆیدا ئێستا شەتاڵ بووە. بەڵام ئەمانە هیچی وانین و هیچ نین لەچاو ئەو خۆشییەی کە خێزانەکە دەستی دەکەوێت لە دوای دوو هەفتەی گریانی منداڵەکە.

## 5- منداڵ و خەبەربوونەوەی شەو

زۆرجار منداڵ فێری خویەک دەبێت کە هەموو شەوێک خەبەری دەبێتەوەو دەست بە گریان دەکات، ئەمەش لەدوای هەڵامەتیک یان سک ئێشەیەک یان گوێ ئێشەیەک یان هەر نەخۆشییەکی ترەوە فێر دەبێت. زۆرجاریش ڕوودەدات هەر کە منداڵەکە خەبەری بۆوەو دەنگی لێوە هات ، خێرا دایک ڕادەکات و لە جێگاکەی هەڵی دەگرێت. هەموو منداڵێک و تەنانەت گەورەش، لە شەوێکدا جارێک یان

زیاتر خەبەری دەبێتەوە و خۆی ئەمدیو و ئەودیو دەکات، بەڵام کاتێک منداڵ چەند شەوێک لەسەریەک خەبەری دەبێتەوە و دایک و باوکیش دەچن بەلایەوە و لە جێگاکەی هەڵی دەگرن، خەوەکەی دەزڕێت و لەبری ئەوەی خەوەی لێ بکەوێتەوە خوو بە دایک و باوکەکەوە دەگرێت و لەسەر ئەم کارە بەردەوام دەبێت.

ئەم حاڵەتە دەتوانرێت بە ئاسانی چارەسەر بکرێت، ئەمیش ئەوەیە دایک و باوک لەو هۆیە تێبگەن کە بووە بەهۆی بەخەبەربوونەوەو خەوزڕانی منداڵەکە، دوورنییە منداڵەکە بەرۆژ زۆر نووستبێت، بەیانیان درەنگ هەڵسێت یان برسی بێت یا سەرما یا گەرمای بێت یاخود دوور نییە بۆ یەکەمجار خواردنێکی خواردبێت، هەرسی نەکردبێت، یان ترسی جیابوونەوە بەسەریدا زاڵ بووبێت، کاتێک دایک و باوکی لەو هۆیە تێدەگەن کە بووە بەهۆی خەبەربوونەوەی منداڵەکە دەتوانن هێمنی بکەنەوەو لەگەڵیا بمێننەوە تا خەوی لێدەکەوێتەوە، ئەگەر هەر چاریش نەبوو، دەکرێت ئەو ڕێگایانەی لە (منداڵ و نووستن) دا باسمان کردووە بەکاربهێنرێت.

بەشی دووەم

منداڵی بچووک

تا 3 ساڵان 1

منداڵی بچووک، 1 تا 3 ساڵان

لەدەورووبەری پازدە مانگیدا، منداڵ پێ دەنێتە قۆناغێکی ترە، کە پێی دەوترێت قۆناغی منداڵی بچووک، ئەمە ماوەی دوو ساڵ و نیو دەخایەنێت و نیشانەکانی ئەم قۆناغە ئەوەیە کە منداڵ دەست بە ڕۆیشتن دەکات و فێری قسەکردن دەبێت. لەم قۆناغەدا منداڵ دەیەوێت خۆی لە دایک و باوک ڕزگاربکات و جیهانی دەورووبەری خۆی بپشکنێ و هەموو شتێک تاقی بکاتەوەو باسی هەموو شتێک بکات، منداڵی بچووک خۆشەویستییەکی تایبەتی بۆ ژیان هەیە، جارجار بۆلای دایک و باوک دەگەڕێتەوە بۆئەوەی وزەی تازە وەربگرێت و دڵنیابێت لەوەی کە دایک و باوک لەم پشکنین و تاقیکردنەوەیەدا ئاگایان لێیەتی. ( بەچ جۆرێک لەم قۆناغەدا دایک و باوک ڕووبەڕووی داخوازییەکانی منداڵ دەبنەوە، کارێکی گەورە دەکاتە سەر منداڵەکەو چۆنییەتی سەرکەوتنی منداڵ بەسەر تەنگوچەڵەمەکانی ژیانیدا، کە لێرەوە بناغەی بۆ دادەنرێت).

لەسەرەتای ساڵی دووەمدا گۆڕانێکی گەورە لە منداڵدا ڕوودەدات، ئەویش ئەوەیە کە منداڵ دەست بە گەڕان دەکات لە ماڵدا، بە ماوەیەکی زۆر کەم ، منداڵ لە گاگۆڵکێکردنەوە هەڵدەستێتە سەر پێ و دوایی بەهۆی دەستگرتن بە کەرەسەکانی نێو ماڵ و دیوارەوە دەست بە ڕۆیشتن دەکات، لێرەدا منداڵ بە تەواوی ناتوانێت بڕوات، بەڵکو چەند هەنگاوێک دەنێت و دەکەوێت و هەڵدەستێتەوەو لەسەر ئەم ڕەوتە بەردەوام دەبێت و لە ژوورێکەوە دەست پێدەکات و دواتر بەهەموو ماڵەکەدا دەگەڕێت، (هەندێ منداڵ لە مانگی 7 و هەندێکیش لە مانگی 16 دا فێری ڕۆیشتن دەبن) ئەمە زۆر درێژە ناخایەنێت و پاشان ماوەیەک منداڵەکە فێری هونەری ڕۆیشتن دەبێت و بێ لەوەیش هەوڵی شتی زیاتر دەدات، وەک: سەرکەوتن بەسەر ئەو کەرەسانەدا کە لەماڵدا هەن و هەروەها پاڵنان بەشتەوە و خۆشاردنەوە لەژێر مێز و زۆر شتی تری لەم چەشنە. منداڵ لەم ماوەیەدا، بەدرێژایی ڕۆژ خۆی لەسەر تاقیکردنەوە ڕادەهێنێت و دڵخۆش دەبێت بەهەر شتێکی تازە کە فێری دەبێت، هەر ئەوەندە دەزانێت کە دەتوانێت بەسەر پێلیکانەکاندا سەرکەوێت و لە پێشا پێیەکی و دوایی ئەوی تریان دەخاتە سەر هەمان پلیکانە و بەمجۆرە دەچێتە سەرەوە.

لەم ماوەیەدا هیچ شتێک لەوە خۆشتر نییە بۆ منداڵەکە کە بجووڵێت و ڕابکات و سەرکەوێ و بکەوێت و هەڵسێتەوە و جارێکی تر ڕابکاتەوە.

کچان زووتر فێری ڕاوەستان و ڕۆیشتن دەبن، ئەویش بەهۆی ئەوەی کۆئەندامی دەماری کچ لە پێشترە وەک هی کوڕ، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کچان زووتر فێری قسەکردن دەبن ، هەرچەندە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان منداڵێک بۆ یەکێکی تر هەیە، لێرەدا گرنگ ئەوەیە دایک و باوک لەوە ئاگاداربن کاتێک منداڵێک لە قسەکردن دوادەکەوێت لەوانەیە لە شتێکی تردا لە منداڵێکی تر لە پێشتر بێت، یاخود ئەو منداڵەی ئەمڕۆ لە شتێکدا دوا کەوتووە، ڕەنگە سبەینێ پێشکەوتنێکی گەورە لە شتێکی تردا پیشان بدات، لەبەرئەوە نابێت ئەوە لەبیر بکرێت کە دوو منداڵ نین لەهەموو شتێکدا لەیەک بچن.

منداڵ لەم ماوەیەدا بەملاو ئەولادا ڕادەکات و بێ ئەوەی گوێ بدات بەوەی کەچی لە ڕێگەدایە، یاخود چی بەسەر دێ، چونکە هێشتا هەر منداڵێکی بچووکە توانای ئەوەی نییە بزانێ ئەنجامی کارەکانی بەچی دەگات، هەروەها منداڵ زۆر دەجووڵێت و بەدارو بەردا

هەڵدەگەڕێت و دەچێت بۆ دەرەوە و دەستکاری هەموو شت و کەرەسەیەکی ناو ماڵ دەکات، ئەمەش وا لە دایک و باوک دەکات، ناچار بن منداڵەکە و دەورووپشتی بپارێزن و بۆ یەکەمجار وشەی نەکەیت بەکاربهێنن، ئەم (نەکەیت)ە، نیشانەیەکی تری ئەم قۆناغەیە.

نەکەیت

خۆت لە شوێنی منداڵی بچووک دانێ، کە هەموو شتێک لەو بەرزترە و هەموو شتەکان لەسەرووی خۆیەوە دەبینێت و ئەو لەژێرەوەی مێز، کورسی، دۆلابی جلوبەرگ، دۆڵابی قاپوقاچاخ، مەکینەی دروونی جلوبەرگ، تەلەفزیۆن، هەموو شتێکە و هەموو شتێک لەو بەرزترە، منداڵ دەیەوێت هەموو شتێک بزانێت چونکە پڕە لە وزە و حەزکردن لە تاقیکردنەوە، دەیەوێت شتی تازە بپشکنێت و تا ئەوکاتەش هیچ شتێک لەرێیدا نەبووە و هەرچی ویستووە لەشوێنی خۆیەوە بۆی ئامادەکراوە، ئێستا پێی گرتووە و دەیەوێت ئەم بەهرە تازەیەی (بەهرەی تاقیکردنەوەو پشکنین) تاقی بکاتەوە، بەڵام گەورە لەم کاتەدا ڕێگای لێدەگرێ کە دەست بۆ هەرچییەک دەبات پێی دەڵێن: (نا نەکەی !)

و بەم وشەیە abstract ئەم(نەء)ە، یەکەم وشەی نێگەتیڤە کە بۆ یەکەمجار بە منداڵ دەوترێت و لەهەمانکاتدا وشەیەکی نابەرجەستەیە قۆناغێکی تازە لە ژیانی منداڵ دەست پێدەکات.

ئەم (نەء)ە زۆر مانای جیاواز بە منداڵ دەبەخشێ، ئەمەش پەیوەندی بەوەوە هەیە وشەکە، چۆن لەگەڵ منداڵەکەدا، بەکاردەهێنرێ، لەوانەیە دایک و باوک هەمووکات پێویستیان بەوە نەبێت کە وشەی(نەء)بەکاربهێنن، بۆ ئەمەش دەتوانن بە زۆر شێوە بە منداڵەکە بڵێن کە شتێک قەدەغەیە و نابێت بیکات، وەک لابردنی تەپڵەیەکی جگەرە، چەرخێک یان گوڵدانێک لەبەردەمی منداڵەکەدا، بەبێ ئەوەی دایک و باوک قسە بکەن، یان دەتوانن سەرنجی منداڵەکە بەلای شتێکی تردا ڕابکێشن و یان زۆر بە هێمنی سەر بلەقێنن و بڵێن نا، ئەمانە هەر هەموویان مانای (نەکەیت)دەگەیەنێن، بەڵام شوێنەوارێکی سلبی و خراپ لە منداڵەکەدا جێ ناهێڵن، وەک هاوارکردن و قیژاندن بەسەر منداڵدا بۆئەوەی شتێک کە دەیەوێی بیکات، ئەو نەیکات.

کاتێک کە دایک و باوک دەڵێن(نەء) مەبەست لەوەیە کە منداڵەکەیان بپارێزن، لەو شتە ترسناکانەی کە منداڵەکە دەیەوێت بیانکات و خۆی نازانێت و تێناگات کە بۆچی ئەو شتانە ترسناکن بۆچی پێی دەوترێت وا نەکات، ئەو دەیەوێت لە دنیا فراوانەکەیدا هەموو شتێک بپشکنێت و هەوڵدەدات ئەو پەیوەندییە بچڕێنێت کە بە دایک و باوکییەوە هەیەتی و متمانە بەخۆکردن لەخۆیدا بەهێز بکات، بەڵام لەهەمانکاتدا کە دەزانێت شتێک گرانە و بەتەنیا ناتوانێت بیکات، دەگەڕێتەوە بۆ لای دایک و باوک و داوای یارمەتی ئەوان دەکات. لە بارێکی وادا ئاگادارکردنەوەی منداڵ بەوەی کە شتێک نەکات یان لێ قەدەغەکردنی دەبێت بەشێکی سەیری لای و تێی ناگات.

بزێویی منداڵ، زۆرتر بەهۆی ئەوەوەیە کە دەیەوێت خۆ تێهەڵقورتێنێت و بپشکنێت، نەک لەبەرئەوە کە حەز بە هاروهاجی یان تووڕەکردنی دایک و باوکی بکات. بۆیە دایک و باوک ئەگەر ئەم ڕاستییە بزانن. ئاسانتر دەتوانن لە منداڵەکەیان تێ بگەن و دان بە خۆیاندا بگرن و کەمتر لێی تووڕەبن، هەرچەندە وا دێتە بەرچاو کە دەیەوێت تووڕەیان بکات.

کاتێک کە منداڵ تەمەنی دەگاتە نزیک دوو ساڵ، ئیتر(نەء و مەکە) دەبێت و بەشێک لەژیانی منداڵەکە و هەر بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لەخۆیەوە دەڵێت(نا) و وا دەردەکەوێت کە ڕقی دایک و باوک هەڵدەستێنێ و لە دژیان قسە دەکات و بە پێچەوانەی ئەوانەوە دەجووڵێتەوە. لەڕاستیدا ئەمە دوو شت دەگەیەنێت:

1- منداڵ دەیەوێت وەک گەورەکان هەڵسوکەوت بکات و لاساییان بکاتەوە و کاتێک کە دەڵێت (نا) دەیەوێت لە گەورەکان بچێت و لەڕاستیدا کە دەڵێ نەء زیاتر بۆ ئەوەیە کە لە تۆ بچێت و نا هەر ناکەی تۆیە.

2- منداڵ لەو ڕێیەوە دەیەوێت ئەوە ڕابگەیەنێت کە پێویستی بە دایک و باوکی نەماوە و تێدەکۆشێ بۆ خۆ ڕزگارکردن.

ئەم ماوەیە لە تەمەنی منداڵ پێی دەوترێت ماوەی(ڕقەبەرایەتی- ڕکابەرایەتی) لەم تەمەنەدا منداڵ دوو وشە زیاد لە پێویست بەکاردەهێنێت و وا پێشان دەدات کە دەیەوێت هاوارو شەڕ و ڕکابەرایەتی بکات، ئەویش وشەی (من) و دووەم وشەی(نا).

(من)مانای ئەوەیە، کە من خۆم ئەم کارە دەکەم.

( نا) بەزۆر شێوە خۆی دەنوێنێ، کاتێک داوا لە منداڵ دەکرێت لاچێت، لاناچێت، یاخود کە ڕق دەگرێت، پاڵ دەکەوێت و لنگەفرتێ دەکات و دەگری ، یاخود خۆی ڕەق دەکات، یاخود ڕا دەکات بۆ دەرەوە و دەست بە شت شکاندن دەکات.

لەکاتێکی وادا، ئەگەر دایک و باوک وا پیشان بدەن کە بەم کردەوانەی مناڵ، زۆر تووڕەن و بەهەمانشێوەش هەستی تووڕەبوونی خۆیان دەربڕن، ئەوا مناڵیش ئەم هەستەی تێدا بەهێز دەبێت و نیشانەیەکە بۆی کە بە مەرامی خۆی گەیشتووە و سەرکەوتنی بەدەستهێناوە، بۆیە چاترە گوێ بەم کردەوانەی مناڵەکە نەدرێت و گرنگییەکی ئەوتۆی پێ نەدرێت، چونکە ئەمە یارمەتی مناڵەکە دەدات کە واز لەم کردەوانە بێنێت و لەبیری بچێتەوە.

جاری وا هەیە کە ویستی مناڵەکە زۆر بەهێزە وا لە گەورە دەکات کە ناچار بێت کۆڵ بدات و بە دڵی ئەو بکات، ئەمەش کارێکی هەڵەیە و ئەنجامەکەشی تا بێت لەگەڵ گەورەبوونی مناڵەکە بەرەو خراپی دەڕوات، بۆیە دەبێت گەورەکان، سنووری دیاریکراو و ڕوونوئاشکرا بۆ مناڵەکانیان دابنێن و بەڕاستی باسی خراپی ئەو کردەوانەیان بۆ بکەن، قسەی زیادەی پێوە نەنێن(درۆودەلەسە) و خۆیان لەو ئەرکە نەدزنەوە، چونکە لە دەرفەتێکی تردا مناڵەکە لەسەر کردەوەکانی خۆی بەردەوام دەبێت و قسە زیاد و ناڕاستەکانی بۆ دەردەکەوێت،( کەواتە قسەکردن لەگەڵ مناڵەکەدا و جارێکی تریش قسەکردن و دووبارەکردنەوەی لەکاتی پێویستدا زۆر گرنگە تاکو مناڵەکە بەتەواوی بۆی دەردەکەوێت کە گەورەکان ڕاست دەکەن).

زۆر کەس پێی وایە کە بە تووڕەبوون و یەکجار قسەکردن لەگەڵ مناڵەکەدا دەتوانێ وا لە مناڵ بکات کە دەست لەو کردەوانە هەڵگرێت و دووبارەیان نەکاتەوە، ئەمە تا ڕاددەیەک ڕاست دێتە بەرچاو، بەڵام دەبێت ئەوە لە بیرنەکەین، کە تووڕەبوون دەبێت بەهۆی ترسانی مناڵەکە، بۆیە بۆ ماوەیەک واز لەو کردەوانە دەهێنێت، بەڵام ئەمە ئەنجامێکی خراپی لێ دەکەوێتەوە و مناڵ فێری ترسنۆکی و درۆزنی دەکات و زۆربەی جاریش لەبەرخاتری ئەوەی ڕووبەڕووی تووڕەبوون نەبێتەوە، نەک تێگەیشتووە لەلایەنە خراپەکانی ئەو کردەوانە دەست لەو کردەوانە هەڵدەگرێت. هەندێجاریش، کاتێک مناڵ لەو شوێنە یان لەو کارە دوور دەخرێتەوە کە نابێت بیکات و دەبرێت بۆ شوێنێکی تر، دەست بە گریان دەکات بۆ دەربڕینی ناڕەزایی خۆی، بۆیە دەکرێت دوای ژێربوونەوە دڵنەوایی بکرێت، چونکە مناڵەکە لەکاتێکی وادا وا هەست دەکات کە ناهەقی لەگەڵدا کراوە، ئەمەش لەئەنجامدا وای لێدەکات لە توانای خۆی دوودڵ بێت و تووشی نەخۆشی شەرم بێت.

زۆرجار دایک و باوک هەست بەوە دەکەن، کە ڕقەبەری و پێداگرتنی مناڵ لەسەر کارێک، تەنها بۆ تاقیکردنەوەی ئەوانەو دەیەوێت بزانێت کە دایک و باوک چی دەکەن، کاتێک ئەم سنووری خۆی تاقی دەکاتەوە، بۆ نموونە : هەندێجار مناڵ کاتی نووستن هاوار دەکات و نایەوێت بچێت بنوێ، بەڵام دایک و باوک بە ئاسانی دەتوانن لەڕێی قسەکردنەوە وا  لە مناڵ بکەن بچێت بنوێت، یان کاتێک هاوار دەکات و دەقیژێنێت و نایەوێت جلەکانی لەبەر بکات، دەتوانرێت بە قسەکردن لەگەڵیدا وای لێ بکرێت جلەکانی لەبەربکات.

لەکاتێکی وادا، گەر دایک و باوک تووڕە بن، ئەوا خۆیان تووشی هەڵەیەکی گەورە دەکەن و لەبری بە دەنگەوە چوون و تێگەیشتن لە مناڵەکە، ئەو کردەوەیە دەکەن بە تەنگوچەڵەمەیەکی گەورەو مناڵەکە دەمکوت دەکەن و تەنانەت دەست لە مناڵەکەش دەوەشێنێن و ڕێ نادەن مناڵەکەیان تاقیان بکاتەوە، کە هەموو ئامانجی مناڵەکە هەر ئەوەیە.

ئەمە ڕاستیەکی گرنگە دەبێت دایک و باوک بیزانن، کە دووریان دەخاتەوە لەوەی بەشێوەیەکی نا دروست و ناهەموار مامەڵە لەگەڵ مناڵەکەیاندا بکەن، هەندێجار کار دەگاتە ئەوەی مناڵ داخ دەکرێت و زیانێکی زۆری لێدەدرێت و دایک و باوکیش ئەم خۆشییەیان لە دەست دەچێت کە دەتوانن لەڕێی قسەکردن و لەیەکتر تێگەیشتنەوە بە دەستی بێنن و لەهەمانکاتیشدا کاتێکی خۆش و پڕ لە گاڵتە و پێکەنین لەگەڵ مناڵەکەیاندا بەسەر بەرن.

ڕقەبەرایەتی مناڵ ئاساییە لەم تەمەنەدا و زاناکان لەو باوەڕەدان و دانیان بەو ڕاستییەدا ناوە کە ئەم سەرپێچیەی مناڵ لەم تەمەنەدا پێویستە بۆ ئەوەی مناڵ پێش بکەوێ و بڕوای بە خۆی بەهێز ببێت و متمانە نەکاتە سەر خەڵکی تر، ئەگەر تۆ بتوانیت ئەم سەرپێچییە و ناڕەزاییانەی مناڵ دوور خەیتەوە لەوەی کە ببێت بە شەڕو بەیەکدا هەڵچوون ئەوە مانای ئەوەیە دەتوانیت سوود لەو سەرپێچییانە وەربگریت و مناڵێکی سەربەخۆ و وشیار بهێنێتە کایەوە. بۆئەمەش پێویستە دایک و باوک لەسەرخۆ و وشیاربن و زەوقی گاڵتە و قسەی خۆشیان لەگەڵ مناڵدا هەبێت، چونکە شێوەی چۆنیەتی دانانی سنوور بۆ مناڵ کارێکی گەورە دەکەنە سەر پاشەڕۆژی مناڵەکە.

زۆر لە زانایانی مناڵ ، ئەم تەمەنە بە گرنگترین قۆناغ لە تەمەنی مناڵ دادەنێن، بۆئەوەی لەدوارۆژدا مرۆڤێکی سەربەخۆی لێ دەربچێت و بتوانێت بە ئاسانی بەرەنگاری ئەو تەنگوچەڵەمانە بێتەوە کە تووشی دێن.

ئەو منداڵانەی، دایک و باوکیان هەمیشە هاوار بەسەریاندا دەکەن کە(نەکەن) و خۆ لە شت بپارێزن، لە دوارۆژدا خەباتێکی سەخت دێتە ڕێیان و تووشی ئازارێکی زۆر ناهەموار دەبن و هەر لەو تەمەنەوە بڕوایان بە خۆیان نامێنێت و تووشی شەرمنی دەبن و ناتوانن بە شێوەیەکی سروشتی ئەو کارانە ئەنجام بدەن کە دەکەوێتە ئەستۆیان.

منداڵ مرۆڤێکە توانایەکی دیاریکراوی هەیە و زۆرجار بۆئەوەی کارێک ئەنجام بدات لە توانای خۆی زیاتری دەوێت، لەبەرئەوەش کە نازانێت تواناو سنووری خۆی چەندە، پێویستی سەرشانی دایک و باوک وەک پەروەردەکار ئەوەیە ڕێگا بە منداڵ بدەن توانای خۆی تاقیبکاتەوە ئەمە ئەوە ناگەیێنێت کە منداڵ بۆی هەبێت هەموو شتێک بکات، چونکە دواجار منداڵ وای لێ دێت هاروهاج و بزێو دەربچێت و هیچ کات نەزانێت سنوور مانای چییەو دەوروپشتەکەشی تووشی ناخۆشی و ئازار دەکات.

جاری وا هەیە دایک و باوک خۆیان دوور دەخەنەوە لەوەی ڕێگا نیشاندەری منداڵەکەیان بن، بەناوی ئەوەوە کە نایانەوێت گەورەو (ئێلیێرسراوی ئەو بن (منداڵەکە خۆی ئاقڵە چی دەکات بابیکات.

ئەمە شتێکی باش نییە، لەبەرئەوەی منداڵەکە ناتوانێت بڕیاری تەواوی خۆی بدات، دووەمیش منداڵ خۆی لە خۆیدا حەز دەکات کە کەسێک هەبێت خۆشی بوێت و لێی بپرسێتەوە بۆیە دانانی سنوورێکی ئاقڵانە بۆ منداڵ پێویستە بە مەرجێک هەوڵ نەدرێت سەربەستی منداڵ بخنکێنرێت.

چۆن وا لە منداڵ دەکەیت کە دەستکاری شت نەکات

ئەمە گرفتێکی گەورەیە بۆ ئەو خێزانانەی کە منداڵی (1 – 3) ساڵانیان هەیە. هەمیشە شتی وا لە ماڵەکەدا هەیە کە منداڵ بۆی نییە دەستکاری بکات، وەکو گوڵدان، تەلەفزیۆن، ڕادیۆ و تەباغی چێشلێنان و گەلێک شتی تر، ئەم گرفتە گەورەترە، کاتێک خێزان دەچێت بۆ میوانی و منداڵ شتی تازەتر و سەیرتر دەبینێ و دەیەوێت تاقییان بکاتەوە.

زۆر دایک و باوک لەکاتی میوانداریدا توند منداڵەکەیان دەگرن و بەدرێژایی ماوەی میوانداریەکە هاوار دەکەن و بەدوای منداڵەکەیانەوەن کە دەستکاری شت نەکات، نەوەکو بیانشکێنێ، تا وای لێ دێ کە منداڵەکە دەست بە گریان دەکات و بە جۆرێکی وا ڕک دەگرێت کە ناچاریان دەکات بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە، یان منداڵەکەیان ئەوەندە زویر دەکەن کە بە گریانەوە خەوی لێ بکەوێت. زۆرجاریش دایک و باوک شەرم دەکەن کە منداڵەکەیان دەستکاری شت دەکات، کە ڕەنگە بۆ خاوەنەکەی شتی بەنرخ بن.

باشترین چارە بۆئەوەی منداڵ وا لێ بکەیت دەستکاری شت نەکات ئەوەیە کە هەر لە زووەوە منداڵەکە دوورخەیتەوە و پێی بڵێیت کە بۆی نییە دەستکاری شت بکات. بۆ ئەمەش پێویست بە قسەو درێژدادڕی ناکات. هەروەکو چۆن کاتێک منداڵێک کە خۆی لە ئاگر نزیک دەکاتەوە و دایکی ڕائەکات و لە ئاگرەکەی دوور دەخاتەوە، ئاواش بۆ هەر شتێکی تر کە دایک و باوک نایانەوێ منداڵەکەیان دەستکاری بکات، دەبێت بەمجۆرە لەگەڵیدا بجووڵێنەوە، خۆ ئەگەر منداڵەکە جارێکی تر گەڕایەوە بۆ لای ئەو شتە ئەوە دەبێت هەر بەهەمانشێوە بەبێ ئەوەی خۆت تووڕەکەیت، دووری خەیتەوە و یاریەکی بۆ بدۆزیتەوە کە بە لایەوە تازەو خۆش بێت، نەک هەر شەقشەقە کۆنەکەی جارانی بدرێتەوە دەستی کە زۆر دەمێکە دەزانی چییە، خۆ ئەگەر پێویست بوو، ئەوا یان دەبێت منداڵەکە لە ژوورەکە بەرێتە دەرەوە، یان ئەو شتەی کە بۆی نییە دەستکاری بکات، ئیتر منداڵەکە لە پاش چەند جارێک تێدەگات و دەزانێ کە بۆی نییە دەستکاری ئەو شتە بکات، چ لە ماڵەوە و چ لە ماڵان.

دڵنەوایی منداڵێک کە خۆی بریندار کردووە
کاتێ کە منداڵێک خۆی بریندار دەکات، دەیەوێت دڵنەوایی بکەیت لێرەدا ئەو دایکوباوکانەی ڕەفتاری هەڵە دەکەن، دوو جۆرن یەکەمیان، ئەو دایکوباوکانەن کە ڕادەکەن و پەلاماری منداڵەکەیان دەدەن،لەبەر ئەوەی کە خۆی بریندار کردووە، منداڵەکە ترسێکی زۆری لێ دەنیشێ، کە زۆرجار ترسەکە زیانبەخشترە لە برینداریەکە.
زۆرجار منداڵ کە خۆی بریندار دەکات، دەیەوێت سەرنجی دایکوباوک ڕابکێشێ، چونکە لە قۆناغی (ئۆئیدیپاڵ) دایە، یان لە قۆناغی (ترسی لە جیابوونەوە) دایە و ئەیەوێت هەموو شوێنێکی بریندار بێت تەنها ئەندامی زاوزێی نەبێت، جا بەم کردەوەیە دایکوباوک ترسیان لێ دەنیشێ و ئەوەندەی تریش ترس لە منداڵەکەدا دەچەسپێنن و وای لێدەکەن بڕوا بەوە بکات کە شتێکی ترسناک ڕوویداوە بەمە منداڵێکی ترسنوکی لێدەردەچێت، منالێک کە هەمیشە شک لەخۆی بکات.

دووەمیان ، ئەو دایکوباوکانەن کە دەیانەوێت منداڵەکەیان ئازا بێت و نەترسێ لە بریندداربوون و بە گاڵتەپێکردنی منداڵەکە یان گوێ نەدات بە برینەکەی، وا ئەزانن چاری ئازاری منداڵەکە دەکەن.
ئەمەش دەبێت بەهۆی ئەوەی کە منداڵەکە لەدوارۆژدا زۆر هەستی تریش لە دڵی خۆیدا بهێڵێتەوە و زۆر بەلایەوە زەحمەت دەبێت کە خۆشەویستی بەرانبەر بە خەڵکی دەورووبەری دەربڕێت.
لەم حاڵەتەدا، باشتروایە دایکوباوک بەهێواشی و لەسەرخۆ منداڵەکە بگرنە باوەش و باسی برینداربییەکەی لەگەڵ بکەن و گرنگییەکی مامناوەندی پێبدەن، زۆرجار ئەم برینانە ئەوەندە هیچن، کە تەنها بە دەست پیاهێنانێک یان ماچێک چاک دەبێتەوە و منداڵەکەش ڕازی دەبێت و نابێت بە منداڵێکی ترسنۆک و لە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیشدا سەرکەوتوو دەبێت و ئاسانتر دەتوانێت پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ خەڵکیدا دروست بکات.

لەپەرتوکی (منداڵەکەت بۆ وا ئەکات)

ویژدان چۆن دروست دەبێت؟

هەر لەم تەمەنەدا و بەدانانی سنوور بۆ منداڵەکە و بە لاساییکردنەوەو دووبارەکردنەوەی ئەم یاسایانە، منداڵ دەست دەکات بەوەی، کە ئەم یاسایانە لە ژیانی ڕۆژانەیدا بەکاربهێنێ، لێرەوە ویژدان دروست دەبێت، بەڵام ئەمە زۆر هێواش و لەسەرخۆیە و زۆر دەخایەنێت .تاکو شێوەی تەواوی خۆی وەردەگرێت و کەسایەتی تایبەت بۆ منداڵەکە دروست دەبێت

ئەگەر منداڵ لێرەوە بە ڕاست و دروستی فێری ئەو یاسایانە بکرێت و گەورەکان درۆی لەگەڵ نەکەن و خۆشیان هەر پێڕەوی ئەو یاسایانە بکەن، کە بەسەر منداڵەکەدا دەیان سەپێنن، ئەوا بناغەی کۆمەڵێکی پێشکەوتوو دادەنرێت و ئەندامەکانی کۆمەڵ دەتوانن بە .ئاشتی و پاکی لەگەڵ یەکتردا بژین

یەکێک لەو بناغانەی دەبێت بەهۆی ئاسوودەیی کۆمەڵ ئەوەیە بزانرێت چی ڕاستە و چی چەوتە، جا ئەگەر ئەمە هەر لە منداڵیەوە بوو بە .یاسای مرۆڤەکانی نێو کۆمەڵ ئەوسا بەلای کەمەوە دەتوانن لەسەر جۆری ژیانیان ڕێک بکەون

لەسەرتاوە منداڵ چەند شتێک ناکات بۆئەوەی گەورەکان لەخۆی زویر نەکات و دڵیان نەرەنجێنێ، بەڵام دوای ئەوەی گەورە بوو، بە تاقیکردنەوە بۆی دەردەکەوێت کە گەورەکان ڕاستیان لەگەڵ کردووەو ئەمیش ئەم ڕاستییە دەکات بە یاسای ژیانی خۆی و ئەو شتانە ناکات کە ناڕاستن، ئەمەش نەک لە ترسان یان لەبەر خاتری ئەوەی دڵی گەورەکانی لێ نەرەنجێ، بەڵکو لەبەرئەوەی بڕوای تەواوی .پێیان هەیە

لێرەدا دەتوانین زۆر لەو هەڵەو چەوتیانەی لەژیانی ڕۆژانەماندا دەیکەین، بیگەڕێنینەوە بۆ ئەم باسە و زۆر نموونە بهێنینەوە بێگومان، .خوێنەریش نموونەی لایە

بۆ نموونە: لە دەرگا دەدرێت، کەچی باوکەکە منداڵەکەی دەنێرێت کە دەرگاکە بکاتەوەو بەو کەسەی لە دەرگا دەدات بڵێت : باوکم لە .ماڵەوە نییە

.یان : تەلەفۆن لێدەدرێت، دایکەکە هاوار لە منداڵەکەی دەکات و کە بڵێ دایکم نووستووە

ئەم کردەوانەی گەورەکان کە بووە بە یاسایان و جۆرێک لە ژیانیان بێگومان لە دایک و باوکیانەوە بۆیان ماوەتەوە و هەر بەو شێوەیەش جارێکی تر بۆ منداڵەکانیان دەمێنێتەوەو بەردەوامیش دەبێت، جا لە بارێکی وادا چۆن چاوەڕوانی ئەوە بکەین مناڵەکانمان .ڕاستمان لەگەڵدا بکەن و جیاوازی بەینی ڕاست و چەوت بکەن و چۆن یاسایەکی ڕاست بۆ خۆیان دابنێن

................................. ......چوونە سەر قەعدە................................
منداڵی دوو ساڵان تێدەکۆشێ بۆئەوەی خۆی ببێت بە سەرۆک دەست بەسەر دەوورووپشتی خۆیدا بگرێت و لە دایکوباوک ڕزگاری بێت، بەتایبەتی لە دایک، جارجار منداڵەکە شێتگیر دەبێت و دەست بە قیژە قیژ دەکات، چونکە لەهەموو جووڵانەوەیەکیدا دەیەوێت خۆی بڕیار بدات. دەیەوێت شتێک بکات کە (ڕاستە) ئەوەی کە دایک پێی باشە یان شتێکی (چەوت) بکات ئەوەی کە دایک پێی باش نییە. هەر لەوکاتە ناسکەشدا زۆر دایکوباوک بڕیار دەدەن کە منداڵەکەیان ئیتر گەورە بووە و دەبێت فێر بێت بچێتە سەر قەعدە و .بتوانێت خۆی ڕابگرێت و پیسایی نەکات بە خۆیدا و فێری کۆنترۆڵکردنی ڕیخۆڵە و میزەڵدانی ببێت
ئەم تەنگوچەڵەمەی چوونە سەر قەعدەیە، دەبێت بە باسێکی گرنگی خێزان و کەسانی دەورووبەری منداڵەکە، بەتایبەتی کاتێ کە خێزانەکە دەیانەوێت منداڵەکە بەزوویی خۆی فێری سەر قەعدە بکات، داوا لە منداڵەکە دەکەن و زۆری لێدەکەن، کە لەسەر قەعدە دانیشێت، لەکاتێکدا ئەو نازانێ بۆچی و لەبەرچی دەبێت ئەمە بکات، کە ئەو توانای نەبێت بەسەر ڕیخۆڵە و میزەڵدانیدا ئیتر بۆچی

زۆری لێ بکرێت، ئەمە لەکاتێکدا کە منداڵەکە لە تەمەنی (ترسی جیابوونەوە) دایە. ئەم باسە وای لێدێت کە ببێت بە ئاگرخۆشکەری هەڵەیەکی زۆر لەنێوان دایکوباوک و منداڵەکەیاندا، یان دەبێت بەهۆی ئەوەی کە منداڵەکە زۆر لەخۆی بکات و بۆئەوەی دایکوباوک ڕازی بکات، ئەمەیش وا دەکات کە ئاودەست و سەر قەعدە ببێت بە مەیدانی زۆرانبازی لە نێوانی دایک و منداڵەکەیدا، بۆئەوەی بسەلمێنن کامیان دەتوانن دەست بەسەر ئەوەیتردا بگرن. زۆر لە شارەزایان هیچ هۆیەک بۆ ڕاهێنانی منداڵ، پێش دوو ساڵ و دوو ساڵ و نیو، بۆ ئەوەی بچێتە سەر قەعدە نابینن و وا بە باش دەزانن کە دەبێت دایک چاوەڕوانکردنێکی ژیرانە و لەسەرخۆی هە بێت، بۆئەوەی ئامانجی باشتر بدات بە دەستەوە، لەوەی، کە زۆر لە منداڵەکە بکرێت، زۆر منداڵ بەرە بەرە وایان لێدێت کە خۆیان حەزبکەن بچنە سەر ئاو، ئەگەر زۆریان لێ نەکرێت و ناچار نەکرێن، چونکە ئەوانیش دەیانەوێت ئەو شتانە بکەن کە گەورەکان دەیان کەن، ئەگەر چوونە سەر قەعدە لە وەختێکی گونجاودا و بە کردەوەیەکی باش لە قەڵەم بدرێ و بکرێت بە خویەکی خۆش بۆ منداڵ ئەوا ئەم تەنگوچەڵەمەیە زۆر گەورە نابێت بە پێچەوانەوە دەبێت بە شتێکی پۆزەتیڤیش بۆ منداڵەکە.
لەمبارەیەوە زۆرشت هەیە کە دایکان ئەتوانن بیکەن، لیرەدا هیوادارم دایکانوباوکان خۆیان بیر لەو ڕێگایانە بکەوە بۆ باشتر و بەسودترین شیوەی چونەسەر قەعدەی مندال بۆئەوەی گفتەگۆیەکی هەمەلایەنەی لەبارەوە بکریت.

توانای قسەکردن

هەروەک لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد، منداڵی ساوا دەست بە بەکارهێنانی چەند دەنگێک دەکات، کە لەوە دەچێت بیەوێت بڵێ (ما......ما....دا.....دا......بابا..) ئەم دەنگانە لە دووبارەبوونەوەدا بەردەوام دەبن و لە سەرەتای ساڵی دووەمدا منداڵ هەوڵدەدات کە ناوی شت بهێنێت بەشێوەیەک کەوا پێدەچێت بیەوێت قسەبکات، ئەم وشانە هیچ پەیوەندیەکیان بەیەکەوە نییە، لەڕووی ڕێزمانەوە ناتەواون و ئەوانەی دەورووپشتی منداڵەکە نەبێت، کەسی تر لە ناوەڕۆکی ئەم قسانە تێ ناگات، چونکە زیاتر ڕەمزین و خێزانەکە خۆیان دەزانن منداڵەکە چی دەوێت، کاتێ سیپان دەڵێت : (پەڕۆ). ئەوە هەر ئەندامانی خێزانەکە دەزانن کە دەیەوێت بڵێت:(پارچە قوماشێکم بدەنێ با بیجووم) یاخود کاتێ دەست بۆ پێڵاوەکانی ڕادەکێشێ و دەڵێت(بابە) مەبەستی ئەوەیە کە بچێت بۆ پیاسە لەگەڵ باوکیدا.

لەم تەمەنەدا منداڵ تینووی وشەی تازەیەو بەهەموو لایەکدا هەوڵدەدات وشەی تازە کۆبکاتەوە و گەورەکان بۆی بسەلمێنن کە ناوی شتەکانی بەڕاستی دەڵێت، کاتێ کە دەست بۆ سەگێک ڕادەکێشێ و دەڵێ سەگ، لەهەمانکاتدا سەیری ئەو کەسە دەکات کە لەگەڵیدایە، ئەمەش ئەوە دەگەینێت کە دەیەوێت بزانێت ڕاستە یان نا و ئەو کەسەش بۆی دەسەلمێنێ کە ڕاستە و سەرێکی بۆ دەلەقێنێ یاخود پێدەکەنێ.( ئەم سەر لەقاندن و پێکەنینە بۆ منداڵەکە زۆر پێویستە) بۆئەوەی منداڵەکە بەردەوام بێت لە گەڕان بەدوای وشەی تازەدا و گەنجینەی وشەکانی خۆی دەوڵەمەندتر بکات، چونکە منداڵ لەم تەمەنەدا زیاتر لەوە دەزانێت کە دەری دەبڕێت، کاتێ کە گەنجینەی وشەکانی پڕ بوو ئەوە ئیتر دوو دوو وشەکان دەردەبڕێ و هەوڵدەدات کە یەکیان بخات و بەپێی ئەو شوێن و کاتەی کە تێدایە دەریانبڕێت، کاتێ کە سیپان دەڵێت:(سیپان نان) دەیەوێت بڵێت سیپان نانی خواردووە یان سیپان نان دەخوات یان دەیەوێت نان بخوات، چونکە بۆ بەکارهێنانی ئامرازی پەیوەندی و کردار، کاتێکی تری دەوێت و پێویستی بە یارمەتی هەیە، ئەمەش بە قسەکردن لەگەڵیدا فێردەبێت .

جا لەو تەمەنەدا قسەی ڕێکوپێک لەگەڵ منداڵدا گرنگەو زۆریش پێویستە. لەکاتی قسەکردن لەگەڵ منداڵدا، دەبێت هەوڵ بدرێت کە ڕستەکانی بەجوانی بووترێت و ئەو قسانەی منداڵەکە بەهەڵە دەیانکات، بەڕاستی بۆی بووترێتەوە بێ ئەوەی پێویست بەوە بکات بە منداڵەکە بووترێت کە ئەوەی ئەو دەیڵێت هەڵەیە و ڕاستییەکەی شتێکی ترە، هەروەها نابێت بەهیچ جۆرێک(گاڵتە) بە منداڵ بکرێت، کاتێ کە قسەکانی ناتەواون بەڵکو دەبێت هەوڵ بدرێت زۆر ژیرانە کە قسەت لەگەڵدا کرد، کردار بکەیت، چونکە ئەو نەک تەنها قسەکانت وەردەگرێ، بگرە چۆنیەتی وتنی قسەکانیش لەگەڵ دەست جووڵان و دەم جووڵاندا لە مێشکی خۆیدا تۆمار دەکات.

لەم تەمەنەدا منداڵ دەتوانێت لەشتی مادی تێبگات، وەک پێڵاو و قەڵەم و کاغەز و ئەم بابەتە وشانە کە منداڵ دەتوانێ بە دەست بیانگرێ، نەک شتی مەعنەوی وەک عەیبە و شێت و زیرەک.

لەم پێشکەوتنەدا منداڵ فێری زۆر شتی تایبەت بە خێزانەوە دەبێت و لاسایی خێزان دەکاتەوە لە قسەکردن و جۆری دەربڕینی هەست و نەستدا و لە چۆنیەتی دەست جووڵاندن و دەنگ بەرزی و زۆر شتی تر... و هەستێکی وا پەیدا دەکات کە لە هەستی خێزانەکەیش دەچێت و بەلای خێزانەکەوە ڕاستە. ئەندامانی خێزانەکەش خۆیان لە منداڵەکەدا دەبینن (باوک لە کوڕدا و دایک لە کچدا) و منداڵەکەش، بەهۆی زمانەوە، زیاتر و زیاتر فێری پەیوەندی دەبێت بە ئەندامانی خێزانەکەوە. لەنێوانی 2 – 3 ساڵیدا، ئیتر منداڵ توانای بۆ بەکارهێنانی (کردار) بە شێوەیەکی خێرا زیاد دەکات و ئەو وشانەی کە لەوەوپێش فێریام بووە بە ڕەزامەندییەوە بەکاریان دەهێنێت و دڵخۆشی خۆی دەردەخات و مانای ڕستەکان و جۆری داڕشتنیشیان باشتر دەبێت .

شتێکی تری ئەم قۆناغە ئەوەیە کە منداڵ دەتوانێت جێناو بەکاربهێنێت و جیاوازی نێوانی( من ... تۆ.. ئەو و ئێمە و ئەوان) بکات و زیاتر لە ڕستەکانیدا بەکاریان بهێنێت.

مێشکی منداڵ زیاتر گەشە دەکات

لە تەمەنی 12 – 18 مانگی بەرەوژوور ، ئیتر منداڵ دەست بە پشکنینی دەوروبەری خۆی دەکات و دەیەوێت هەموو شتێک بزانێ و تاقیان بکاتەوە، بێ لەوەش فێری ئەوە دەبێت کە ڕوداوێک بەهۆی ڕوداوێکی ترەوە دەبێت، وەک ئەوەی کاتێک یارییەکی دەکەوێتە ژێر بەتانییەکەوە، بەتانییەکە ڕادەکێشێت بۆئەوەی یارییەکەی بدۆزێتەوە.

لە تەمەنی دوو ساڵیدا منداڵ دەتوانێ بە نیشانە ئیشوکاری خۆی جێبەجێ بکات، لەبەرئەوە یاریی گاڵتە بەکاردەهێنێ، وەک ئەوەی کە تەلەفۆنەکە بەرز دەکاتەوەو وا پیشاندەدات کە قسە لەگەڵ کەسێکدا دەکات، یاخود بە گاڵتەوە دەستی بە سابوون دەشوات یاخود خۆی دەکات بە سەگ و لەسەر چوار پێ دەڕوات.

یەکێک لەو پێشکەوتنە گرنگانەی لە مێشکی منداڵدا ڕوودەدات، ئەوەیە کە منداڵ ئێستا دەزانێت کە شتێک ئەگەر لەبەرچاویش نەبێت هەر هەیەو لە شوێنێکی ترە، لەگەڵ پێشکەوتنەکەشدا منداڵ ناتوانێ لەوە بگات کە شت نابێت لەهەمانکاتدا لە دوو شوێن بێت.

لەم تەمەنەدا، منداڵ فێری چەند شتێکی تازە دەبێت و دەزانێت کە دوو کەمترە لە سێ و جیاوازی نێوانی شەو و ڕۆژ، ئێستا و دوایی و بەم زووانە و سبەینێ دەکات، ئەمەش بەوەدا دەردەکەوێت کە منداڵ دەتوانێت چاوەڕێ بکات و بزانێ مەبەست لە(دوایی)ئێستا نییەو مەبەست کاتێکی ترە.

ئەم منداڵە بچووکە فێر بووە کە وا بکات کە شت ڕوبدات و پێی دڵخۆش بێت، وەکو گڵۆپ داگیرساندن و کوژاندنەوە، ڕادیۆو تەسجیل و تەلەفزیۆن داگیرساندن و کوژاندنەوە و دەنگ نزم و بەرز کردنەوەیان. ئەم منداڵە کە ئێستا خانووەکە و ژوورەکان و باخچەکە باش دەزانێت و دەزانێت شتومەک لەکوێ دانراوە و چۆن پیاو بەدەوری خانووەکەدا دەتوانێت بڕوات و بچێت بۆ ماڵی دراوسێکەی و لەوێ دانیشێت، بەڵام تەنها ئەوەندە دەتوانێت، ئەگینا ئەگەر منداڵەکە لەشوێنێکی تر بێت ناتوانێت ماڵی دراوسێکە بدۆزێتەوەو بچێت بۆئەوێ، هەرچەند ئەگەر شوێنەکەیش نزیک بێت.

منداڵ لەم تەمەنەدا بانگی نەنەو باپیرەی دەکات و ناویان دەبات، بەڵام نازانێ کە نەنە دایکی دایکێتی و باپیر باوکی دایکی یاخود بابە گەورە باوکی باوکیەتی، هەروەها نازانێ کە (ئامۆزاو پورزاو خوشکەزا...) ئەمانە چین تەنها ئەوە نەبێت کە ئەمانە ناسیاون و پەیوەندییەکیان بە خێزانەوە هەیە، جا لەبەرئەوەی هەتا منداڵ لەمانە دەگات ئەم وشانە تەنها وەک ناوێک بەکاردەهێنێت و مێشکی منداڵەکە هەر خەریکی ڕێکخستنی ئەم ناوانەیە لە خانەی تایبەتیدا و هەر شتە خانەی تایبەتی خۆی هەیەو هەموو شتێک دەبێت ڕێک بکەوێت لەگەڵ سەرجەمی خەیاڵاتی منداڵەکەدا وەک کورت یان درێژ، بەرز یان نزم، گەورە یان بچووک.

سێ ساڵان لە ڕێکخستنی ئەم شتانەدایە و سیستمێکی تایبەتی دادەنێت بۆیان و دەیگۆڕێت و ئیتر ئەمە دوایی نایەت. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەم سێ ساڵانەیە سنووری پێشکەوتنی مێشکی خۆی هەیە و زیاتر لەشتی مەعنەوی تێدەگات و ناتوانێت تێی بگەیێنێت کە کیلۆیەک خۆی و کیلۆیەک کا وەکو یەک قورسن و یەک کێشیان هەیە. هەروەها هەتا ئێستاش هەستی خۆیی منداڵ کزە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێک بە سۆران بڵێت: کە ئەو ناوی سۆران نییە و کەسێکی تر ناوی سۆرانە، ئەوا تووشی ترس دەبێت و سوورە لەسەر ئەوەی کە هەر ئەو ناوی سۆرانە و ئەم قسەیە دەبێت بەهۆی ئەوەی کە(هەستی خۆیی) منداڵەکە بریندار ببێت، ئەمە ئەگەر پیاو زۆر بەڕاستی پێی بڵێت و بە گاڵتەوە نەبێت، زۆر زەرەری هەیە بۆ منداڵەکە.

یاری یاخود پشکنین

زۆرتری ژیانی ڕۆژانەی منداڵ بە هەڵسوکەوت یا جموجۆڵ پڕ دەبێتەوە، کە ئێمە پێی دەڵێن:(یاری) ئەم (یاری)یە، شتێکی گرنگە بۆ منداڵ و یارمەتی دەدات کە دنیای دەوروپشتی(بپشکنێ) و شتی تازە بدۆزێتەوە یاریکردنی منداڵی دوو ساڵان بۆ ئەوەیە کە شتێک ڕوبدات، کاتێ دوو سەرەقاپلەمە بەیەکدا دەدات، بۆئەوەیە بزانێت چی ڕوئەدات، کاتێکیش کە کەوچکەکەی فڕێ دەدات یان کاتێ کاغەزێکی بەردەمی دەدڕێنێت و سفرەکە ڕادەکێشێ، مەبەستی ئەوە نییە کە شتێک بکات و بگاتە ئەنجامێک و شتێکی دەست بکەوێت. یارییەکە دەست پێدەکات و لەپڕێکا بۆ یارییەکی تر وازی لێدەهێنێ، بەبێ ئەوەی یاری یەکەمی تەواو کردبێت.

ئەم منداڵە بچووکانە لەیەک شوێندا یاری دەکەن ، زۆرجار ئاگایان لەیەکتری نییە، منداڵ نازانێت کە کەسی تر لەگەڵیدا دانیشتووە و یاری دەکات، بەڵکو بە جارێ چووەتە ناو یارییەکەی خۆیەوەو یاری بە ئۆتۆمبێلە تەختەکەی خۆی دەکات، یان خۆڵ دەکاتە ناو قاپێکەوە بەبێ ئەوەی بەلایەوە گرنگ بێت کە یاری لەگەڵ منداڵێکی تر دەکات، ئەمەش مانای ئەوەیە کە پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەنێوانی دوو منداڵی دوو ساڵیدا ڕونادات و هەتا ئێستا نەبووە بە مرۆڤێکی کۆمەڵایەتی. منداڵ لەم تەمەنەدا حەزی لەهەموو جۆرە یارییەکە، کە جووڵانی تیا بێت، وەک بەسەر داردا سەرکەوتن، ڕاکردن بەدوای یەکتردا، بازدان و چاوشارکێ و زۆر یاری تر. زۆرجار دایک و باوک سەریان سووڕدەمێنێت لەوەی کە چۆن ئەم منداڵە بچووکە ئەوەندە وزەی تێدایە، بەڵام منداڵ ساتێ پشووی هەیە و زۆرجار حەزدەکات کە گوێی لە حیکایەتێک بێت یان دانیشێ و سەیری تەلەفزیۆن بکات، لەم کاتەدا زۆر بەتەواوی پشوو دەدات و دەچێتە .جیهانێکی ترەوە یان دایک و باوک سەریان سووڕدەمێنێ کە چۆن منداڵەکەیان گۆڕانیەکی لەبەرکردووە و دەیڵێتەوە

کاتێ کە منداڵ لەنێوانی 5، 1 – 2 ساڵی دایە، دەست بە لاسایکردنەوەی گەورەکانی دەورووپشتی دەکات، ئەمە مانای ئەوەیە کە منداڵ لەم کاتەوە دەتوانێت بە (نیشانە) بیربکاتەوە و شتێک لەجیاتی شتێکی تر بەکاربهێنێ. بۆیە دەبینین کە منداڵ یاری بووکەبووکێنە دەکات و نانی دەداتێ و ڕایدەژەنێ و دەیشوات و شەڕی لەگەڵ دەکات ئەم هەڵسوکەوتانە (نابێت بەهیچ شێوەیەک لە منداڵ تێک بدرێت و گاڵتەی پێبکرێت)، بەڵکو دەبێت یارمەتی منداڵ بدرێت و بە گرنگییەوە وەڵامی پرسیارەکانی بدرێتەوە و تەنگوچەڵەمەکانی نێوانی خۆی و بووکەکەی بۆ چارەسەر بکەیت، یاخود یاری بە ئەسپ و ورچ و عەرەبانەوە ئۆتۆمبیل و موتورسیکلێک دەکات بە .بەکارهێنانی ئەو شت و داروبەردەی لەبەردەستی دایە و بە تەواوەتی بە ڕاستیان دەزانێت

زۆرجار منداڵ لاسایی گەورەکان دەکاتەوە و تاکە پێڵاوێک دەکات بە تەلەفۆن و لەگەڵ یەکێکی تر قسە دەکات، دایک و باوک نابێت سەریان لەوە سووڕبمێنێت کە منداڵەکەیان لاساییان دەکاتەوە، کاتێ کە چا دەخۆنەوە یاخود کاتێک باوک ڕیش دەتاشێت،(کچانیش ئەم لاساییە دەکەنەوە) چونکە ئەمە دەری دەخات کە منداڵەکە لەوە زیاتر دەزانێت کە تۆ پێی دەزانیت. هەندێ یاری سەردەمی ساوایی هەر لەگەڵ منداڵدا بەردەوام دەبێت جارجار منداڵ خۆی دەکشێنێ بۆ باوەشی دایکی و دەیەوێت پەنجەی خۆی بمژێ و لە باوەشی دایکیدا .خۆی مەڵاس دەدات

لە تەمەنی 3 ساڵیدا منداڵ لەگەڵ یەکێکی تر یان دوو منداڵی تردا دادەنیشێ و یاری دەکەن. بە گەورەبوونی منداڵ یارییەکان زیاتر .ڕێکوپێک دەبێت و ئامانجێکی تێدایە و سەرەتا و دوایی هەیە

(منداڵ و درۆکردن (ناڕاستی وتن

لەدەورووبەری سێ ساڵیدا، لەدوای ئەوەی کە منداڵ فێری وشە بەکارهێنان بوو، دەگاتە ئەو تەمەنەی، کە بتوانێت قسە بکات و هەتا ڕاددەیەک مانای وشەکان دەزانێت و دەتوانێت چەند وشەیەک بەیەکەوە ڕێک بخات و مانایەکیان بداتێ، خەیاڵی فراوانی منداڵ زۆر بە خۆشییەوە ئەم وشانە بەکاردێنێت. منداڵ دەست دەکات بە(خەوبینینی ڕۆژانە) و شتی وا دەدۆزێتەوە و لە خەیاڵیدا دەیکات کە لە ڕاستیدا بۆی ناکرێت و بۆی ناچێـە سەر. ئەم منداڵە سێ ساڵییە دەکەوێـە ئاسمانی خەیاڵاتەوەو قسەو باسی وا دەکات کە لای دەورووپشتی بە درۆزنێکی گەورە لە قەڵەم بدرێ، حیکایەتی وا دەگێرێتەوە کە مەگەر هەر خۆی بزانێت لەکوێی هێناوە و لەگەڵ کێدا ڕوویداوە، یاخود هەر بە ئاسانی درۆ دەکات و دەڵێ کە هاوڕێکەم بوو، یاخود (ئازاد) بوو کە پەرداغەکەی شکاند ( لە کاتێکدا کە هاوڕێی نییە و بەتەنیا دانیشتووە) زۆر لەو حیکایەتانەی منداڵەکە دروستیان دەکات، ئەوەندە ڕوون و ئاشکران کە دەبنە جێگای پێکەنینی دایک و باوکی .منداڵەکە

منداڵ لەم تەمەنەدا وا دەزانێ کە دایک و باوکی هەموو شتێک دەزانن، هەموو شتێک دەبینن، هەتا دەشزانن کە منداڵەکە چۆن و بیر لەچی دەکاتەوە و بیرو هەستی چۆنە. بەڵام بە تەواوەتی سەرپشک نییە لەم ڕاستییەدا و باشترین ڕێگا بۆئەوەی ئەم ڕاستییەی بۆ دەرکەوێت ئەوەیە، کە درۆیەکی گەورە بکات بۆئەوەی ڕاستییەکەی بۆ دەرکەوێت، کە دایک و باوک هەموو شتێک دەزانن، جا بۆیە منداڵ لەبەرئەوە درۆ ناکات بۆئەوەی دایک و باوکی و دەورووپشتی بخەڵەتێنێت، هەوڵیش نادات کە بیشارێـتەوە کە شتێکی خراپی کردووە، هەرچەندە دەشڵێت کە من نەبووم ئاوەکەم ڕشت، بەڵکو (سامان) بوو، کە لەوکاتەدا سامان لەوێ نییە و کەسیش بەو ناوەوە ناناسێ، ئەمە تەنها بۆئەوەیە کە بزانێت دایک و باوک چەند ئاگایان لە خۆیانە و چەند دەزانن و وایان لێبکات کە زیاتر گرنگی پێبدەن. لێرەدا کە ئەمجۆرە درۆیانەی منداڵەکەت لەتەمەنی سێ ساڵیدا، بەرگوێ دەکەوێت، پێویست بەوە ناکات خۆت تووڕە بکەیت، یان وا پیشان بدەیت کە بڕوای پێدەکەیت، لەجیاتی ئەمە دەتوانیت بە گاڵتەوە پێی بڵێیت: (ئەوا ئەحە دەستی کرد بەسەر گوزشتەی دروستکراو) لەگەڵ زەردەخەنەیەکی فراواندا باوەشی پێدا بکەیت و ماچێکی بکەیت، چونکە ئەمە وا لە منداڵەکە دەکات کە زیاتر لەخۆی دڵنیا بێت و .بزانێت سنووری درۆ و ڕاستی چییە

ئەم درۆ و خەیاڵاتەی منداڵ لە تەمەنی دوو و سێ ساڵیدا و بەکەمی زۆرجار ترسناک نییە و پێویست بە دڵگرانی ناکات، بەڵام ئەگەر وای لێهات کە درۆکان لە سنووری خۆیان چوونە دەرەوەو بەشێکی زۆری ژیانی منداڵەکەی داگیرکرد و منداڵ هەر خەریکی ئەمجۆرە سەرگوزشتانە بوو، ئەوسا پێویستە زوو بە فریایدا بگەیت و زیاتر گرنگی پێ بدەیت و باسی ئەو شتە باشانەی بۆ بکەیت کە دەیانکات، هەرچەندە زۆر شتی گرنگیش نەبن، بۆئەوەی وای لێ نەیەت کە ڕوو بە جیهانێکی پڕ لە خەیاڵ و شت دروستکردن بکات.

ئەم کارە زۆر گرانەو پێویستی بە توانایەکی زۆر هەیە و پێویستە هەموو دەورووپشتی منداڵەکە یارمەتی یەکتر بدەن بۆئەوەی لەو ناخۆشیەی خۆی هەستی پێ ناکات ڕزگاری بکەن، چونکە زۆرجار هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی خێزانی منداڵەکە و نەبوونی ژیانێکی پڕ خۆشەویستی.

## هاوڕێی گاڵتە

هاوڕێیەکی گاڵتە و خەیاڵ بۆ منداڵ، ڕۆڵێکی گەورە دەبینێ لەم تەمەنەدا، ئەم هاوڕێیەش منداڵ خۆی بۆخۆی دروستی دەکات و هەمیشە و لەهەموو شوێنێک لەگەڵیدایە، ئەمەش لەوانەیە مرۆڤێک بێت یان ئاژەڵێک بێت کە منداڵەکە هەڵسووکەوتی لەگەڵدا دەکات هەروەک هاوڕێی ڕاستەقینەی بێت، لەبەرئەوە قسەی لەگەڵ دەکات و لەکاتی نانخواردندا قاپی بۆ دادەنێ و حەز دەکات جێگایەکی تایبەتی لەسەر سفرەکە هەبێت. ئەمە وەکو هاوڕێیەک وایە بۆ منداڵ (منداڵی تاقانە زۆرتر هاوڕێی گاڵتەی هەیە، وەک لە منداڵی تر) و بەکاری دەهێنێت بۆئەوەی لەکاتی پێویستدا منداڵەکە گوناهی ئەو بگرێت و هەر هەڵەیەک ڕوو دەدات بیخاتە پاڵ ئەو، ئەگەر پەرداغێک یان یارییەک بشکێت، ئەوە گوناهی منداڵەکە نییە و گوناهی هاوڕێ گاڵتەکەیەتی، کەواتە ئەم هاوڕێ گاڵتەیە دەبێت بە یەکێک کە هەموو هەڵەو ژێر کەوتنەکانی منداڵەکە لەکاتی پێشکەوتندا دەپۆشێت و گوناهەکانیش، دەدرێنە پاڵ ئەو، هەروەها ئەو ڕەخنەیەی لە منداڵەکە بگیرێت، یان هەر ئازارو ڕووداوێکی ناخۆش ڕوبدات، بەسەر هاوڕێ گاڵتەکەیدا دەدات و بەمشێوەیەش لە ئازاری خۆی کەم دەکاتەوە.

کاتێ کە (ئەحمەیان) برد بۆ خەستەخانە بۆ دوورینەوەی پەنجەی کە بریندار بووبوو، یاریەکیشیان لەگەڵ خۆیاندا برد، ئەویش ورچەکەی بوو. دوای ئەوەی پەنجەیان دوورییەوە و هاتنەوە ماڵەوە ئیتر(ئەحمە) فێری شتی تازە بووبوو، هەرچییەکی لە خەستەخانە لەگەڵدا کرابوو، ئەمیش لە ماڵەوە لەگەڵ ورچەکەیدا دەیکرد و بەشەو برینەکەی دەپێچێ و شرینقەی لێدەدا و دەستی دەهێنا و بەسەریدا و دەیخستە جێگاکەی خۆیەوە. بەمە ئازارەکەی خۆی کەم دەکردەوە و دەیخستە سەر هاوڕێکەی.

جا ئەگەر هاوڕێ گاڵتێنەکەی منداڵەکەت ئەم ڕۆڵە گەورەیەش بۆ منداڵەکەت نەبینێت، ئەوا هەر کاری خۆی دەکات و خەیاڵی منداڵ ڕادەهێنێ و زۆر تەنگوچەڵەمەی منداڵ کەم دەکاتەوە و زیانی زیاترە لە قازانج ئەگەر ئەم خەیاڵە لە منداڵەکەت بستێنیتەوە و هەوڵبدەیت پێی بسەلمێنیت، کە هاوڕێی نییە و گاڵتەی پێ بکەیت، بۆیە باشتر وایە وازی لێبهێنێت و دەست نەخەیتە کاری ئەم پەیوەندییەی نێوان (منداڵەکە و هاوڕێ گاڵتێنەکەی (هەرچەندە هەندێجار منداڵ ئەمە بەکاردێنێ بۆئەوەی قسەی ناشرین بکات و خەتاکەیشی بخاتە پاڵ ئەو.

ئەم هاوڕێ گاڵتێنەیە جاری وا هەیە، کە چەند هەفتەیەک یان چەند مانگێک دەمێنێ دوایی ون دەبێت و جارێکی تر دێتەوە و ون دەبێتەوە و دەبێت بەژێر ئۆتۆمبێلەوە و لەناودەچێت و گورگ دەیخوات و دەکەوێتە ناو ئاوێکەوە ، یان هەر لەخۆیەوە ون دەبێت. ئەمە هەمووی شتێکی ئاساییە لە جیهانی خەیاڵی منداڵدا و لەم تەمەنەدا و لەوانەشە تا تەمەنی(5 – 6) ساڵان هەر بمێنێت. گرنگ ئەوەیە، کە دایک و باوک ڕێزێکی تەواوی ئەم هاوڕێ گاڵتێنەیەی منداڵەکە بگرن و چۆن بە باشی دەزانێت ئاوا ڕەفتاری لەگەڵدا بکەن.

## کوڕو کچ و جیاوازی نێوانیان

لەژیانی منداڵی ساوادا، بەتەواوەتی جیاوازی لەنێوانی کەسایەتی و حەزو جۆری یاری کوڕو کچدا دەبینرێت، لەبەرئەوەی هەموو ڕووداوەکان هەر لەکاتی لەدایکبوونی منداڵەوە تا ئێستا وای کردووە، کە جیاوازی لەنێوانیان بکەین.

یەکەم پرسیار، کە دایک لە مامانەکەی دەکات ئەوەیە: منداڵەکە کوڕە یان کچ؟ لەدوای زانینی وەڵامەکەی ئیتر هەموو بیرو هەست و کرداری دایکەکە بەپێی وەڵامەکەی دەگۆڕێت. لەبەرئەوەی هەر لە سەرەتاوە ڕۆڵی منداڵەکە لەژیاندا شێوەی تایبەتی خۆی وەردەگرێت. ئیتر بەمجۆرە هەست و بیرو کرداری ئێمە دەگوازرێتەوە و بەسەر منداڵە ساواکەدا دەسەپێنرێ، تەنانەت پێش ئەوەی خۆی بزانێت، کە هەیە یان نا!

ڕاستە جیاوازی بایۆلۆژی لە نێوانی کچ و کوڕدا هەیە، بەڵام ئەمە یەکەم هۆکار نییە بۆ جۆری هەڵسوکەوتی منداڵ، ئەم بیرە لە دایک و باوکەوە بۆ منداڵ دەگوازرێتەوە، لەشێوەی چاوەڕوانی و هەست و کردەوەی دایک و باوکەوە بەرامبەر منداڵەکە وای لێدەکات کە

ورده ورده هەستی پێبکات. وەکو دایک و باوک، جیاواز دەجووڵێتەوە بەرامبەر کچەکە یان کوڕەکە چونکە ئەمە لە دایک و باوک و کۆمەڵەوە بۆمان ماوەتەوە، وافێر کراوین، ئەم خواست و نەستەی دایک یان باوک و جۆری مامەڵە لەگەڵ منداڵەکەدا، وا لە منداڵەکە دەکات کە وەک کوڕ یان وەک کچ ڕەفتار بکات.

زۆرمان بە چاوێکی بەستراوەوە سەیری هەڵسوکەوت دەکەین، کە ئایا ژنانەیە یان پیاوانەیە. کوڕێک هەر لەکاتی لەدایکبوونیەوە، وا چاوەڕوانی لێدەکرێت، کە تووڕەتر بێت لە کچ، هەر لە ڕۆژی لەدایکبوونەوە، دایک بە جۆرێک کچەکەی هەڵدەگرێ و بەرزی دەکاتەوە. کە جیاوازە لە هەڵگرتنی کوڕ، زۆر پشکنین دەریانخستووە، کە دایک بە جۆرێک قسە لەگەڵ کچەکەی دەکات، کە جیاوازە لەگەڵ قسەکردن لەگەڵ کوڕەکەی. هەر لە منداڵیەوە دایک و باوک، لەڕووی جلوبەرگ لەبەرکردن و جۆری هەڵبژاردنی یارییەوە، جیاوازی لەنێوانی کچ و کوڕدا دەکەن، چونکە چاوەڕوانی ئەوە دەکەن کە کوڕەکەیان کوڕ بێت و کچەکەشیان کچ، بەمەش ئەم هەستە لەلای منداڵەکە بەهێز دەکەن.

دایک و باوک و پەروەردەکاران هەر لە سەرەتای تەمەنەوە، منداڵ لە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی چڕەوە دەگلێنن و بڕیار بەسەر منداڵەکەدا دەدەن، کە چۆن بیر بکاتەوە و چی بکات، ئەمانە بەبێ ئەوەی مەبەستیان بێت منداڵەکە زیاتر بەرەو لایەک ڕاکێشن، چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکەن کە بە جۆرێک بێت (گونجاو) بێت لەلای کۆمەڵ و ئەگەر شتێکی(نەگونجاو) کرا ئەوا پێی دەوترێ و ئاگادار دەکرێتەوە کە ئەمە(ڕاست)نییە. باوک، چاوەکانی دەدروشێتەوە و زۆر بە شانازییەوە پێدەکەنێ و دەیگێڕێتەوە کە چۆن کوڕە سێ ساڵەکەی هەوڵی دا بەسەر دارێکدا سەرکەوێ، بەڵام بە ترسەوە باسی ئەوە دەکات کە چۆن کچەکەی هەوڵی دا هەمان شت بکات و ئەم خێرا فریای کەوت و نەیهێشت بکەوێتە خوارەوە، هەردوو منداڵەکە، کاتێ ئەم گێڕانەوەیە دەبیستن، هەست بەوە دەکەن و هەوڵدەدەن بەپێی بینینی باوکەکە خۆیان ڕاست بکەنەوە.

منداڵێکی تەمەن 18 مانگ بەپێی جنسی کوڕ و کچ خۆی جیادەکاتەوە، هەرچەندە ئەمە هیچ بەلایەوە گرنگ نییە و هیچ جیاوازییەک نابینێ لە نێوانی خۆی و ئەوی تردا، بەڵام ورده ورده هەست دەکات بە جیاوازی لەنێوانی(پیاوانەو ژنانە)دا. دوو ساڵانەیەک دەزانێت کە هاوڕێیەکەی کوڕە یان کچ، بەبێ ئەوەی کە یەکتریان پشکنی بێت، منداڵ لەم تەمەنەدا دەیەوێت لاسایی دایک و باوکی بکاتەوە، باوک ئۆتۆمبێل و تراکتۆر و مەکینەی گەورە لێدەخوڕێ بۆیە کوڕ لاسایی ئەو کارانەی باوک دەکاتەوە، دایک بە ئیشوکاری نێو ماڵ و بەخێوکردنی منداڵەوە خەریکە، بۆیە کچیش یاری بە بووکە شووشە دەکات و دەیەوێت ببێت بە مامۆستاو سستەر، خۆ ئەگەر دایک و باوکی منداڵەکەش ئەمانە نەکەن ئەوا ڕۆژانە زۆر کەسی تر لە دەورووبەری خۆیان و لەکۆمەڵدا دەبینن، کە ئەو کارانە دەکەن، لەبەرئەوەی دەڵێین کە منداڵ هەر لە ئێستاوە ئەو ڕۆڵە دەبینێ کە بە ژنان یان پیاوان لە کۆمەڵدا دەدرێت، خۆ ئەگەر بە کچێکی سێ ساڵانە بڵێیت کە تۆ کچ نیت و کوڕیت، زۆر تووڕە دەبێت و زۆریش پێی ناخۆشە و سوورە لەسەرئەوەی کە کچە نەک کوڕ. ڕوانینی کۆمەڵ لەبارەی کچ یان کوڕەوە، بەرەو گۆڕان دەچێت، بەڵام کوڕ هەروەکو(کوڕ)و کچیش هەروەکو(کچ)ڕەفتاری لەگەڵدا دەکرێت و تا ئێستاش کە کوڕێکی منداڵ دەگری، پێی دەوترێت کە(عەیبە کوڕ ناگری) یاخود کە کچێک شەقەزللەیەک بهاوێت، پێی دەوترێت(خلە کورانی) و (کچێ عەیبە تۆ چۆن شەق دەهاوێژیت).

سنووردانان بۆ منداڵ

لەهەر قۆناغێکی ژیانی منداڵدا، هەندێ شت هەیە، کە نابێت منداڵ بیانکات، چونکە لەو کۆمەڵەدا بەباش نازانرێت و لەسەر منداڵیش پێویستە کە پێڕەویان بکات، بۆئەوەی وەک ئەندامێکی کۆمەڵ قبوڵ و پەسەند بکرێت، ئەم دەستوورانە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر و لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی تر جیاوازیان هەیە.

دایک و باوکان پێویستە ئەوە بزانن، کە چەند شتێکی بنەڕەتی هەیە کە دەبێت ئاگایان لێی بێت، بۆئەوەی پەروەردەکردنی منداڵ، هەم بۆ خۆیان و هەم بۆ منداڵەکان، ئاسانتر بکەن:

1- پێویستە لە کاتی خۆیدا منداڵ فێری ئەو دەستوورانە بکرێت کە پێویستە بیانزانێت، منداڵێکی تەمەن7مانگان ناتوانێ دەست بگرێ بەسەر ڕیخۆڵەکانیدا، لەبەرئەوەی هیچ پێویست ناکات زۆری لێ بکرێت کە فێری چوونە سەر قەعدە ببێت. زۆربەی منداڵان ڕازین بەوەی ڕۆتینی تازە فێر ببن، بەڵام پێویست بە لەسەرخۆیی و توانایی هەیە و دەبێت خۆیان تا سنوورێک بتوانن بڕیار بدەن، بۆئەوەی بە ڕەزامەندی خۆیان کارەکە بکەن، نەک لەبەرخاتری گەورەکان یان لە ترساندا، (زۆرکردن لە منداڵ هەر لە پێشەوە بەژێرکەوتن مەحکومە).

2- کاتێک کە دایک یان باوک بیەوێت منداڵەکەی شتێکی تازە بکات (یان نەیکات) باشترین ڕێگا (قسەکردنە) لەگەڵ منداڵەکەدا، قسەی خۆش، شێوازی گفتوگۆ و ڕازیکردن، کە بە زوویش ئەنجام بەدەستەوە دەدات و وا لە منداڵەکەش دەکات کە دایک و باوکی خۆش

بووێت و نەیموێت لە دەستی بچن. ڕووخۆشی و پیاهەڵدان بەڕاستی بەبێ زۆر پێوەنان و زێدەڕۆیی. لەجیاتی تووڕەبوون و قسەی ناشرین و هاوارکردن و شێتگیربوون، باشترین پاداداشتە کە منداڵ لە دایک و باوکی دەخوازێت و دایک و باوکیش دەگەیەننە ئەنجامی خۆیان بەبێ ئەوەی تووشی هەڵە ببن، کە زۆرجار تووش دەبن لەبەرئەوەی نازانن دنیای منداڵ چۆنە و لەبیریان چۆتەوە کە .خۆیان چۆن بوون و چیان ویستووە و دایک و باوکیان چۆن بوون و چیان لەگەڵ کردوون

3- ، کاتێک دایک یان باوک دەیەوێت دەسەڵاتی خۆی بەسەر منداڵدا بسەپێنێت و سەرپشک بێت و سووربێت لەسەر بڕیاری خۆی دەبێت هەر جارێک کە بڕیارێکی دا، کاری پێبکات و خۆی لە درێژدادڕی دوور بخاتەوە. منداڵ بۆی نییە کە دەیەوێت بچێتە بەر دەرگاکە یان نا، ئەمە باشترە لەوەی کە دوو دڵ بێت لە بڕیارەکەیدا، منداڵ هەست بەوە دەکات کە بەڕاستی نییە، چونکە تەنها ئەوە بەس .نییە بە منداڵەکە بووترێت، کەشتێک بکات یان نا، بەڵکو پێویستە منداڵەکە لە دەموچاوی دایک یان باوکدا بیخوێنێتەوە

4- دوورکەوتنەوە لە ئامۆژگاریکردن و باسکردنی چاکەو خراپەی کردەوەی منداڵ، چونکە منداڵ لەم تەمەنەدا نازانێت عاقڵ، زیرەک، بێحەیا، کەر و تەمەڵ... چییە و وا لە منداڵ دەکات، بەهەموو جۆرێک دایک و باوک تاقی بکاتەوە. هەرچەندە زۆرجار دەبێت بە منداڵ بووترێت کە نابێت شتێک بکات، بەڵام ئەو هەر دەیکات ، لێرەدا ئامۆژگاریکردن و زیاد لەسەر ڕۆیشتن سوودی نییە و باشتر وایە منداڵەکە لەشوێنی خۆی هەڵگری و بیگۆزێتەوە بۆ شوێنێکی ترو هەوڵ بدەیت سەرنجی بۆ شتێکی تر ڕابکێشی ئەگەر خۆشەویستی بە منداڵ ببەخشرێت و لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر بڕیارەکە سوور بێت، ئەنجامی کارەکە سەرکەوتووتر دەبێت و منداڵیش .سنووری خۆی باشتر دەزانێت

کاتێ منداڵێکی تر لەدایک دەبێت

لە دەوروبەری ئەم تەمەنەدا پێویستە منداڵ لەسەر ئەوە ڕابهێنرێ، کە برایەک یان خوشکێکی دەبێت، ئەگەر خێزانەکە بڕیاریان دابێت کە منداڵی تریان ببێت، چونکە هاتنی منداڵێکی تر بۆ ناو خێزانەکە، دەبێت بەهۆی تەنگوچەڵەمەیکی گەورە بۆ ئەو منداڵانەی کە هەن و .کار دەکاتە سەر هەڵسوکەوت و پێشکەوتنی مێشکیان

دایک و باوک دەتوانن حەسوودی منداڵەکانی تریان بەرانبەر منداڵە تازەکە کەم بکەنەوە، ئەویش بەوەی کە قسەیان لەگەڵ بکەن و بۆیان باس بکەن کە برایەک یان خوشکێکی تریان دەبێت، بۆئەوەی لە کوتوپڕ تووشی ڕاچەنین نەبن و بەلایانەوە سەیر نەبێت. دەتوانرێت وایان تێ بگەیەنرێت کە ئەوانیش بەشدارن لە هاتنە دنیای منداڵە تازەکەوە یارمەتی دایک یان باوکیان بدەن. کاتێک کە دایک و باوک باسی منداڵە تازەکە، لەگەڵ منداڵەکانی تردا دەکەن، باشتر وایە تێیان بگەێنن کە زۆر شت هەروەکو خۆی دەمێنێتەوە و جیاوازییەکی زۆر لەناو خێزانەکەدا نابێت و باسی چاکەی ئەوەیان بۆ بکەن کە منداڵێکی تر دەبێت و دەبێت ئەوانیش هاریکاری بکەن و ئاگایان لێی بێت و یاری لەگەڵدا بکەن. هەرچەندە زۆریش هەوڵبدرێت ناتوانرێت لە حەسوودی منداڵەکان کەم بکرێتەوە و ئەمەش شتێکی زۆر ئاساییە. (سیپان) یازدە مانگان بوو کاتێک بۆمان باسکرد کە ئیتر هاوڕێیەکی بۆ پەیدا دەبێت، ئەویش برایەک یان خوشکێتی و لە پاش چەند مانگێکی تر دەیبینێت گرنگیەکی زۆری دا بە مەسەلەکەو شەو و ڕۆژ هەر باسی ئەوە بوو کەی ئەم هاوڕێیەی دێت، زۆرجار سەری ئەخستە سەر سکی دایکی و گوێی لە منداڵەکە دەگرت، کاتێک کە(سۆران) لە سکی دایکیدا لەقەی دەهاویشت. ئیتر سیپان دەهات و دەستی لێدەدا، تا وای لێهات منداڵەکەی لە ئێستاوە دەناسی، بەڵام دوای چەند هەفتەیەک کە سۆران لەدایکبوو، سیپان پرسیاری لە دایکی کرد کە ئایا کەی سۆران دەچێتەوە بۆ خەستەخانە؟

منداڵی بچووک بەزۆر جۆر حەسوودی خۆی دەردەبڕێ و هەندێجار دەیەوێت کە منداڵە تازەکە ئازار بدات، لەم کاتەدا پێویستە بە زووترین کات منداڵە گەورەکە دووربخرێتەوە و لەو شوێنەدا لاببرێت و بە ئاشکرا بۆی دەربخرێت کە ئەمە کارێکی خراپەو بە هیچ جۆرێک نابێت دووبارەی بکاتەوە و بەمە سنووری بۆ دیاری بکرێت، پێویست ناکات زیاتر بۆی ڕوونبکرێتەوەو باسی ئەوەی بۆ بکرێت کە ڕاست نییە، لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت وای پیشان نەدرێت کە ئەم منداڵێکی بێحەیا و خراپە، چونکە ئەمە شتێکی ئاساییە و دەبێت ئەوە بزانرێت کە منداڵی بچووک لەوە دەترسێ منداڵە تازەکە جێگای ئەو بگرێتەوەو ئیتر ئەم لەبیر بچێتەوە یاخود حەسوودی خۆی بەوە دەردەبڕێ کە دەبێتەوە بە منداڵ و لاسایی منداڵە بچووکەکە دەکاتەوە، یان بۆڵەبۆڵ بۆ شتێک دەکات کە ڕێی نادرێت، یان مان دەگرێت لەوەی کە ئەو کارانەی کە چەند ڕۆژێک لەمەوبەر بە ئاسانی خۆی دەیکرد، ئێستا بۆی ناکرێ و نایکات، چەند هەفتەیەک لەمەوبەر دەیتوانی جلەکانی خۆی لەبەر بکات و ئێستا نایکات، یاخود داوای حیکایەت دەکات کە بۆی بگێڕدرێتەوە یا دەیەوێت لەلای دایک یا باوکی بنوێت، قسەکانی منداڵانە دەبنەوە و جاری واهەیە کە بە جارێ لاڵ دەبێت و وشەی بۆ دەرنابڕدرێت، یاخود لە پڕێکا تووڕە دەبێت و جاری واش هەیە میز دەکات بە خۆیدا، هەموو ئەمانە نیشانەی ئەوەن کە منداڵەکە هەست بەوە دەکات یاخود دەترسێ لەوەی کە بخرێتە پشتگوێ و ئیتر خۆشەویستی دایک و باوکی لە دەست بچێ، چونکە گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە تەنها ڕێگایەک

بۆئەوەی خۆشەویستی دایک و باوکی بۆ بمێنێ، ئەوەیە کە وەکو منداڵە بچووکەکە بکات و لاسایی ئەو بکاتەوە. ئەگەر منداڵێک ئەم نیشانانەی تێدا دەرکەوت و زانرا کە هۆکارەکەی بۆ بوونی حەسوودی دەگەڕێتەوە ئەوا باشترین کار ئەوەیە کە دوو شت بکەین.

یەکەم: هەوڵ نەدەین وا لە منداڵەکە بکەین خۆی بە گەورەتر بزانێت، وای لێ بێ شەرم لە خۆی بکات، لێرەدا منداڵەکە وای لێدێ کە لە نێوانی شەرم و سەربەستیدا یەکێکیان هەڵبژێرێ. سەربەخۆیی ناتوانێت و شەرمیش باش نییە بۆی.

دووەم : بۆی باس بکرێت کە خۆشت دەوێت، لەبەرئەوەی ئەم گەورەتر و زیاتر دەزانێت و منداڵە بچووکەکە بە قەدەر ئەو نازانێت، ماوەیەکی تری دەوێت تا ئەویش گەورە دەبێت و شت فێر دەبێت.بەمە منداڵەکە شانازی بەخۆیەوە دەکات و ترسی کەم دەبێتەوە.

بەشی سێیەم

منداڵ لە تەمەنی باخچەی ساوایاندا

( ساڵان 6 -3)

منداڵ لە تەمەنی باخچەی ساوایاندا (3- 6 ساڵان):

لە تەمەنی دوو ساڵ و نیو و سێ ساڵیدا منداڵ دەچێتە تەمەنێکەوە کە پێی دەوترێت تەمەنی (باخچەی ساوایان) و لە ماوەی سێ ساڵی داهاتوودا منداڵ بە گۆڕانێکی یەکجار گەورەدا دەڕوات کە قورسترین و ناخۆشترین ماوەیە لەهەموو ژیانی پێشکەوتنەدا، هەتا دوو ساڵ و دوو ساڵ و نیویش پەیوەندی لەگەڵ خێزانەکەیا پەیدا دەکات، ئیتر پێویستە منداڵ لێرەوە نەختێ لەو پەیوەندییەی کە بەخێزانەوە هەیەتی کەم بکاتەوە و لەجیاتی ئەوە پەیوەندی بە هاوڕێکانییەوە بکات لە باخچەی ساوایان ئەم کارە زۆر گرانەو هەروا بە ئاسانی مەیسەر نابێت، بەڵام بۆ پێشکەوتن و سەربەخۆیی و پێگەیشتنی منداڵ زۆر پێویستە.

ئەم قۆناغە پێی دەوترێ (ئۆئیدیپال) لەبەرئەوەی منداڵ لەم قۆناغەدا، لەڕووی جنسییەوە، عاشقی دایک و باوکی دەبێت(کوڕ عاشقی دایک و کچ عاشقی باوکی دەبێت)لەدوای ئەم قۆناغە منداڵ وای لێدێ کە وەک کوڕ یان کچ لەخۆی ڕازی بێت و بەتەواوی لە جنسی خۆی بگات. لەم قۆناغەدا هەستی منداڵ پێشدەکەوێت و لەدوای ئەوەی کە هەر پەیوەندی بە باوک و دایکییەوە هەبووە، ئێستا پەیوەندی بەزۆر کەسانی ترەوە هەیە و بە چاوێکی جیاواز سەیری خۆی و دەورووپشتی دەکات هەر لەم قۆناغەشدا منداڵ ویژدانی بۆ دروست دەبێت و شێوەی کۆتایی بۆ دروست دەبێت، فێری ئەوە دەبێت کە بۆی هەیە چی بکات و چی نەکات. بە مانایەکی تر فێری ڕاست و چەوت دەبێت. لەوانەیە لەم قۆناغەدا براو خوشکی تازەی بۆ پەیدا ببێت، ئیتر ئەمە مانای ئەوەیە کە تێکۆشانێکی زۆری لەبەردەمدایە بۆئەوەی شوێنی خۆی لەناو خێزاندا دیاری بکات. ماوەی ئەو سێ ساڵەی داهاتوو پڕە لە ڕوودانی گۆڕانکاری لە گەشەکردنی مێشک و هەست و جەستەی منداڵ، هەموو ئەمانەش پێویستن بۆئەوەی بتوانێ بەرەنگاری دنیای دەرەوە ببێتەوە و بتوانێت لەگەڵ منداڵانی تردا لە قوتابخانە یاری بکات و پێش بکەوێت.

ژیانی کۆمەڵایەتی

ژیانی کۆمەڵایەتی منداڵی کوردەواری زۆر هەنگاو لەپێش ژیانی کۆمەڵایەتی منداڵانی وڵاتانی ئەورووپاییەوەن و منداڵی کورد بەهۆی ئەو ژیانە دەوڵەمەندە کۆمەڵایەتیەی کە لە دەورووپشتییەتی دەتوانێت زۆر شت فێر ببێت بەبێ ئەوەی کە پێویستی بەوە بێت بچێت بۆ باخچەی ساوایان، هەروەها بەهۆی زۆری ئەندامانی خێزانەوە منداڵ فێری هەڵسوکەوت و کاری کۆمەکی دەبێت یاخود ناچار دەبێت وا بکات بۆئەوەی ئەندامانی کۆمەڵ قبووڵی بکەن و هەر لە منداڵییەوە فێری ئەوە دەبێت کە ڕێزی ئەوانەی دەورووپشتی بگرێت. خۆ ئەگەر بێت و ئەم وزە گەورەیەی خێزان باشترو ڕاستر و بە شێوەیەکی زانیاری بەکاربهێنرێت ئەوا منداڵ هەزاران باخچەی ساوایانی بۆ دێتەماڵەوە.

................................خەیاڵ و ڕاستی...........................

کاتێ منداڵ دەگاتە تەمەنی دوو ساڵ و نیو و سێ ساڵ، توانای قسەکردن و کۆنترۆڵی بەسەرزماندا بە ئاشکرا دەردەکەوێت. لە تەمەنی سێ ساڵیدا منداڵ(چەنەبازێکی تەواوە) لەبەرئەوەی زۆرجار ئەوەی دەیڵێت زۆر ئاقڵانە دێتە بەرچاو، چونکە لەوانەیە بە هەڵە لە توانای هەست و مێشکی منداڵ بگەین. هەنگاوێکی گرنگی ئەم قۆناغە ئەوەیە کە منداڵ زیاتر جیاوازی لە نێوانی خەیاڵ و ڕاستیدا دەکات، بەڵام ماوەیەکی تری دەوێت کە بە تەواوەتی سنووری ئەمەی بۆ دەربکەوێ و تا ئەو کاتەش ئاوات و ترس و خەیاڵی منداڵ هەر بە هەڵەدا دەچێت، هەرچەندە ئەم منداڵە شتێک دەزانێت لەبارەی دەوروبەری و خەڵکی و شوێن و شتومەک دەناسێتەوەو دەزانێ چی بۆ هەیە بیکات و نەیکات، لەگەڵ ئەمەشدا ژیانی پڕە لە خەیاڵات و ئەندێشە.منداڵانی باخچەی ساوایان لە ژیان ڕادەکەن بەوەی بە خەیاڵ خۆیان لە شوێنێکی تردا ببیننەوە و بە خەیاڵ دەبن بە فریشتەیەک و بە سواری ئەسپێکی سپییەوە لە شاری پەرییەکاندا دەگەڕێن، .بووکێک یان یارییەکی تر لە باوەشیدا دەبێت بەڕاستی و زۆرجار دایکوباوک دەترسن کە منداڵەکەیان تووشی شتێک بووبێت منداڵێکی چوار ساڵان بڕوای وایە کە خەڵکی ناو تەلەفزیۆن ڕاستین و لەناو تەلەفزیۆنەکەدان و فلیمی کارتۆنی منداڵان ڕاستین و ئەو دەنگەی لە ڕادیۆکەوە دێت لە مرۆڤی ڕاستییەوە دێت، کە چۆتە ناو ڕادیۆکەوە و پرسیاری دەکات کە ئەمانە چۆن چوونەتە ناو ڕادیۆو .تەلەفزیۆنەکەوە.

خەوێکی ناخۆش منداڵەکە دەترسێنێ و تا دوای خەبەربوونەوەش وا دەزانێ کە خەوەکە ماوە. کوڕ زۆرجار لەوە دەترسێ کە ببێت بە کچ و کچ دەترسێت ببێت بە کوڕ، منداڵ وا دەزانێ کە دایکی برا بچووکەکەی لە بازاڕ کڕیوە یان لە خەستەخانە قەرزی کردووە و وا دەزانێ کە دایکی کچی دەبێت و باوکی کوڕی دەبێت، مێشکی منداڵەکە لە نێوانی(3 – 6) ساڵیدا گەشە دەکات، بەڵام زۆر گرنگە بزانین منداڵەکە تا ئێستاش لە تێگەیشتن و خەیاڵاتیا سنووردارە و کاری وا نەدەین بە سەریدا کە لە توانایدا نەبێت، بەتایبەتی ئەمە زۆر گرنگە کاتێ کە منداڵ لەلای کەسێکی تر بێت و نەزانێت توانای چەندە و کاری قورس بدات بەسەریدا یاخود پرسیاری قورسی .لێبکات

منداڵ چەند دەزانێت و سنووری زانینی چەندە؟

لەم تەمەنەدا توانای دەربڕینی هەست و نەستی منداڵ بە ڕەمز بە تەواوەتی دەردەکەوێ، منداڵ دەست دەکات بە بەکارهێنانی نیشانە(وشەو وێنە) بۆئەوەی ڕووداوی ڕاستی بگێڕێتەوە. بە مانایەکی تر، منداڵ ڕووداوێک بە وێنەکێشان یان بە یاری دەردەبڕێت. ئەمە تێگەیشتن و ئەو زانیارییانەی لە مێشکیدا کۆیکردوونەتەوە دەردەخات. بیرکردنەوەی منداڵ لەم تەمەنەدا زۆر نیشانەی وای تێدا .دەردەکەوێت کە پیشانی دەدەن کە ناتوانێت بە تەواوی لە ڕاستی ئەو کارانە بگات کە لە دەوروپشتیدا ڕوودەدەن

بیرکردنەوەی منداڵ لەم تەمەنەدا زۆر خۆپەرستانەیە و تەنها بیر لەخۆی دەکاتەوە ، هەر لە سووچی خۆیەوە دەبینێت و ناتوانێ و ئەوە تێناگات کە مرۆڤێکی تر لە سوچێکی ترەوە هەمان شت دەبینێت. ئەگەر داوا لە منداڵێکی تەمەن 4 – 5 ساڵانێک بکەیت کە باسی ئەوەت بۆ بکات لەلای تۆوە دیارە لە خانوویەک یان ئاژەڵێک ئەوە باسی ئەوەت بۆ دەکات، کە لەخۆیەوە دیارە. منداڵێک کە باسی ڕووداوێک دەکات لەم تەمەنەدا بەلایەوە زۆر گرانە وا باسی بکات کە خەڵکی تێی بگات، منداڵ وا دەزانێ کە خەڵکی تریش(هەروەها ئاژەڵ و شتی مردووش) هەر هەمان هۆی هەیە بۆ کردەوەکانی وەکو منداڵەکە خۆی. سەگەکە دەوەڕێ، چونکە برسیەتی، پاسەکە خێرا .دەڕوا، چونکە دەیەوێت بچێتەوە بۆ ماڵەوە بۆلای دایکی

منداڵی باخچەی ساوایان ناتوانێ بزانێ کە هەمان ئاو کە دەکرێتە پەرداغێکی شێوە لوولەیی بەرز بەقەدەر ئەو ئاوەیە کە لە پەرداخێکی پاندایە و هەر هەمان شت دەبینێت. منداڵ زۆر سەری بەیەک خەسڵەتەوە قاڵە. ئەویش (بەرزییە). وا تێدەگات کە ئەم پەرداغە لوولەییە .بەرزە زیاترە ئاو دەگرێ لە پەرداغە نزمەکە لەکاتێکدا کە هەردوو پەرداغەکە بەقەدەر یەک ئاو دەگرن

لەبەرئەوەی هەتاکو ئێستاش منداڵ لە(هۆ و ئەنجام) ناگات لەبەرئەوە ناتوانێ بەیەکیانەوە ببەستێ، دوو ڕووداوی جیاواز کە بەڕێکەوت .بەیەکەوە ڕوویان دابێت لە مێشکی منداڵەکەدا یەک هۆی هەیە هەر یەکەیان لەوانەیە ببێت بەهۆی ئەوی تریان

بۆ نموونە: دایکێک بۆ منداڵەکەی باسکرد کە لە پاش کاتژمێرێکی تر بەفر دەبارێت، (گوێی لە دەنگوباسی ئاوو هەوا بوو لە ڕادیۆدا) منداڵەکە لە پەنجەرەکەدا ڕاوەستاو چاوەڕوانی کرد تا بەفر باری. منداڵەکە زۆر سەری سووڕما لەوەی کە قسەکانی دایکی بوو بەهۆی .(بەفربارین، دایکی وتی: بەفر دەبارێ و باری (ڕووداوێک بوو بەهۆی ڕووداوێکی تر

نیشانەیەکی تری ئەم تەمەنە ئەوەیە کە (ئاژەڵ و دارو درەخت و تەنانەت شتی مردووش) هەستی مرۆڤی دەدرێتی، پیاو نابێت گوڵ بکاتەوە، لەبەرئەوەی ئازاری پێدەگات) گوڵەکان خۆیان دادەپۆشن و پەلکەکان دەدەن بەسەر خۆیاندا، چونکە سەرمایانە، یاخود هیلاکن و دەیانەوێت بنوون، چۆلەکەکان دەخوێنن و بانگی دایکیان دەکەن مانگەکە لە پشت هەورەکەوە خۆی دەشارێتەوە، چونکە شەرم دەکات .و زۆر شتی تری لەم بابەتە

بیری منداڵ لە ڕاستییەوە بەرەو خەیاڵ دەچێت و دێتەوەو جارێکی تر دەڕواتەوەو دێتەوە، ئەمە هەمووی لە ساتێکی کورتدا، منداڵێک زۆر بەبەزەییەوە، بووکە شووشەکەی هەڵدەگرێ و دەرمانی دەکات و برینەکەی بۆ دەپێچێ و دڵنەوایی دەکات، کەچی لە پڕێکا فڕێی دەدات و ڕادەکات بۆ یارییەکی تر. منداڵ لەم تەمەنەدا وادەزانێ کە هەرچی ڕوودەدات. بەهۆی هێزی مرۆڤەوەیە. ئەو هێزەی، کە دەیەوێت شتەکە لەبەرخاتری منداڵەکە ڕووبدات و بەس. کاتێک کە منداڵێک دەچێتە دارستانێکەوە لەوانەیە پرسیار بکات کە کێ ئەم .هەموو گەڵایانەی بە دارەکانەوە هەڵواسیوە، پێش ئەوەی ئێمە ببێین، یاخود کێ ئاسمانی ڕاگرتووە

منداڵ ناتوانێ تێبگات کە زۆر واقعی جیاواز هەیە و خەو شتێکە و ڕاستی شتێکی تر. ئەو شێرەی لە خەویدا پەلاماری داوە یاخود نەڕاندوویەتی بەسەریدا، ئێستاش هەر لە ژوورەکەیدایە و داوای دەرکردنی دەکات، چونکە وا دەزانێ کە تۆش دەیبینی و وادەزانێ کە تۆ و گەورەکانی تریش دەزانن ئەو بیر لەچی دەکاتەوە. گەورەکان زۆر بەهێزن و دەتوانن هەموو شتێک بکەن. ئەمە زۆرجار وا لە منداڵ دەکات کە درۆ بکات یاخود حکایەتی خەیاڵاوی بگێڕێتەوە. منداڵ لەم قۆناغەدا هیچ لە بارەی(کاتەوە)نازانێ، ژیانی ڕابردووی خۆی لەبیر نەماوە و دواڕۆژ شتێکی خەیاڵاوییە و مانای نییە، کاتێ کە منداڵ فێری چەند وشەیەک دەبێت، کە پەیوەندی بە کاتەوە هەیە هیچ شتێک تێناگات و نازانێ ئەمانە چین. کات شتێکی بەیەکەوە بەستراوی دووروودرێژ نییە، کە بەشکرابێت و تێگەیشتنی تەواوی ئەمڕۆ و دوێنی و سبەینێ دەخایەنێی تا منداڵ دەست بە چوونە قوتابخانە دەکات. لەم تەمەنەدا منداڵ زۆر لەخۆی دەکات بۆئەوەی فێری ڕۆژەکانی هەفتە و مانگ ببێت و لەوانەیە وەرزکانی ساڵیش بزانێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێت بزانێت کە کات چەندە و ماوەیەکی .تری دەوێت کە فێری کاتژمێر ببێت

منداڵ لەم تەمەنەدا زۆر بەزوویی شتی لەبیر دەچێتەوە ، بەڵام هەر لەگەڵ ئەوەشدا باسی ڕووداوێکی کۆنت بۆ دەکات و لەوانەیە بە دووروودرێژی باسی خانوویەکت بۆ بکات کە پێشتر دیویەتی یان ناوی کەسێک کە ساڵی پێشووتر بینوویەتی، تا دەشتوانێ بەتەواوەتی باسی ڕوخساری دەکات. ئەمە لەکاتێکدا کە ناتوانێت باسی هەموو ڕووداوەکان بەیەکەوە بکات. منداڵ زۆر لەخۆی دەکات بۆئەوەی لەوە تێبگات کە تۆش وەکو ئەو بچووک بوویت، چونکە بە شتێکی سەیری دەزانێت کە تۆیش جارێ لەجاران بچووک بوویت و دایک و باوکت داوایان لێکردوویت بڕۆیت بنوویت و بە گوێت نەکردوون. بەلایەوە سەیرە کە ڕۆڵی مرۆڤ لە ژیاندا دەگۆڕێت و لە منداڵەوە دەبێت بە ژن و پیاو و گەورە دەبێت. بەلای منداڵەوە کات شتێکی شاراوە و سەیرە کە جیاوازی تەمەنی تۆو ئەو هەروەکو یەک دەمێنێتەوە. کەواتە لەم قۆناغی پێشکەوتنەدا سەرت لە منداڵ سووڕنەمێنێ کە زۆرجار چەند زیرەکەو زۆرجاریش .چەند سادەیە

ترسی منداڵ

لە سێ ساڵیەوە منداڵ زیاتر گرنگی بە لەشی خۆی دەدات و جۆرێک پشکنین لە لەشی دەکات و ئێستا گرنگی بە(ئەندامی زاوزێ)ی دەدات. هەر لەبەرئەوەی خۆشە، دەست دەکات بە یاریکردن پێی، زۆر دایک و باوک ناڕەحەت دەبن کاتێک ئەم کارە سروشتی و ئاساییە لە منداڵەکەیان دەبینن، بەتایبەتی کاتێ کە خەڵکی تر چاوی لێبێت.لێرە بە دواوە ئەو گرنگییەی لەلایەن منداڵەوە بە لەش دەدرێت .لەبەر ترسانی ونبوونی ئەم پارەچەیەیە لە لەش

کچێک بەوەی کە هەوڵدەدات دەستی بووکە شووشەکەی لێبکاتەوە یان هەڵیبوەشێنێت و بزانێ چی لە ناوەکەی دایە، سەرسوڕمانی خۆی دەردەبڕێت. (کوڕیش ئەمە دەکات) منداڵ گرنگیەکی کوتوپڕ بەرانبەر ئەوەی چۆن لەش ئیش دەکات پیشان دەدات و دەست بە پرسیارکردن دەکات. پرسیارەکانی منداڵ لەم تەمەنەدا زیاتر لەبارەی ئەوەوەیە کە چۆن چاو ئیش دەکات. منداڵ لە کوێوە دێت، یاخود چی ڕووئەدات کاتێک کە ئەنداکێکی لەش ون بێت و زیاتر گرنگی بە ڕووشاندنی قاچ و دەستی برینداری بچووک بچووک دەدات و داوا دەکات دەرمان بکرێت و ببەسترێت، کە زۆرجار ئەم برینانە ئەوەندە هیچن کە بەدەست پیاهێنانێک چاک دەبنەوە. منداڵێک کە زۆر بە خۆشیەوە یەکەمجار دەچێت بۆ لای سەرتاش، ئیتر لێرە بەدواوە دەترسێت و حەز ناکات بچێتەوە بۆلای. قسەی نێوانی منداڵی .ئەم تەمەنە بریتییە: لە هەڕەشە و سەربڕین و دەستبڕین و گوێ دەرهێنان و زمانبڕین

ترسی کوڕ

لە سێ ساڵیدا منداڵ زۆر حەز بە یاریکردنی ئەندامی زاوزێی خۆی دەکات و بەشتێکی بەنرخی دەزانێت و دەیەوێت پیشانی بدات.( لەبەرئەوەیە کە زۆرجار منداڵ لە حەمامەکەوە ڕادەکاتە دەرەوە بۆ ناو خەڵکەکە) ئەم شانازییە و نرخ پێدانە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە

منداڵ دەیەوێت پیشانی بدات کە ئەویش وەکو باوکی وایە و دەیەوێت بەو بۆنەیەوە خۆی بە خەڵکی بناسێنێ. کوڕێک لەم تەمەنەدا زۆر .شانازی بە گەورەییەوە دەکات، بە شانازییەوە باسی باوک و برا گەورەکەی و مامەکانی دەکات. کە چەند گەورەو چەند ئازان

لەبەرئەوەی کە منداڵ لەم تەمەنەدا خۆپەرستە، وا دەزانێ کە هەموو کەسێک ئەندامی زاوزێی وەکو ئەمی هەیە، بۆیە زۆرجار لە بارەی جیاوازی کوڕو کچەوە نازانێت، بەڵام دوای ئەمە فێر دەبێت و ئیتر ئەو وێنەیەی کە لە خەیاڵیدا هەبووە، بە جارێ دەگۆڕێ و بۆی دەردەکەوێ کە ئەندامی زاوزێی کچ جیاوازە لەهی کوڕ. وتمان کە منداڵەکە(خۆپەرستە) لەبەرئەوە کوڕەکە وای لێک دەداتەوە کە کچەکەش هەمان ئەندامی هەبووە. بەڵام لێی سەندراوەتەوە یان لێی کەوتووە، بۆیە ترسی ئەوەی لێدەنیشێ کە ئەمیش لێی بسەنرێتەوە، ئەمەش بۆ منداڵی سێ ساڵان شتێکی تازەو سامناکەو دەیترسێنێ، لەوانەیە دەست بکات بە گەڕان بە دوای ئەندامی کچەکەدا، چونکە وا دەزانێ شاردویەتیەوە، بۆیە بۆئەوەی خۆی ڕازی بکات و لەم ترسە دوورکەوێتەوەو پیشانی بدات کە لەشی ئەم تەواوە و ئەندامەکەی ون نەکردووە، یاری پێدەکات و ڕای دەکێشێ و جارجار لە نێوانی ڕانەکانیدا دەیشارێتەوەو بەری دەدات بۆئەوەی بیسەڵمێنێ کە ماوە، یاخود خۆی خەریک دەکات بەهەموو لەشی خۆیەوەو هەر کە شوێنێکی بریندار دەبێت یان دێشێ، تەنها ئەندامەکەی نەبێت کە ساغە، بۆیە هەر تاو نا تاوێ ڕادەکات و شوێنێکی بریندار بووە و دەیەوێت بۆی ببەسترێت و دڵنەوایی بکرێت یاخود بڕیار دەدات کە کچان ترسناکن و دەبێت لێیان دوورکەوێتەوەو وا دەزانێت گەر کچێک دەستی بەر دەستی بکەوێت، ئەوا ئەندامەکەی ئەمیش ون دەبێت، لەبەرئەوە سەرت سووڕنەمێنێت کە سێ چوار ساڵانێک بەهیچ جۆرێک نایەوێت لەلای کچێکەوە دانیشێ یان دەستی لێبدات یان ماچی بکات. ئەمانە هەمووی قەدەغەیە و نابێت ڕووبدەن. هەر ئەم منداڵە چوار ساڵانە هەوڵدەدات، کە ئەم ترسە لەسەر خۆی لابدات و تێکۆشانێکی هەمیشەیی دەکات بۆئەوەی ئەندامەکەی بپارێزێ، بەڵام ئەمە چەند ساڵێکی زۆر دەخایەنێت و منداڵ بە جارێ هەراسان .دەکات و ئازاری دەدات

ترسی کچ

کچ لەم تەمەنەدا هیچ جیاوازییەک لەنێوانی خۆی و کوڕێکدا نابینێت، تەنها ئەوە نەبێت کە ئەوان قژیان کورتترە و جلەکانیان جیاوازە. کاتێ لە کچێکی منداڵی سێ ساڵان پرسیار کرا، کە ئایا ئەو منداڵەی لەولایەوە یاری دەکات کوڕە یان کچ، لەوەڵامدا وتی: نازانم چونکە جلی لەبەردا نییە. لە تەمەنی سێ چوار ساڵیدا ئەم کچە بۆی دەردەکەوێت کە لەشی کوڕ جیاوازە لە لەشی کچ و دەبێت بەهۆی ترسی کچەکە کە لەوانەیە ئەم خۆی بریندار کردبێت، یان ئەم پارچەیەیان لە لەشی کردبێتەوەو بیری بۆ ئەوە دەچێت کە ڕۆژێ لەڕۆژان ئەمیش ئەم پارچەیەی هەبووە و ئێستا ونبووە. ئەمە دەبێت بەهۆی ترسی کچەکە لەوەی کە پارچەی تری لەشی لەناوبچێت یان لێی ببێتەوە و دەیەوێت ئەمیش ئەم ئەندامەی هەبێت و دەست دەکات بە گەڕان بەدوایدا و دەبێت بە پزیشکێکی چاک بۆ عەمەلیاتکردنی بووکەکەی. بۆئەوەی جارێکی ئەم ترسە نەکات، ئەوا بیر لەوە ئەکاتەوە کە دایکیشی نییەتی و ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەمیش وەکو دایکی .لێ دێ. بەهەرحاڵ، تەنگوچەڵەمەی ئەمیش لە کوڕ کەمتر نییە و دەبێت زۆر ژیرانە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێت

کوڕ و کچ حەز ئەکەن لەیەک بچن

زۆرجار دەبینین کە کوڕ حەز دەکات مەمکی هەبێت، یاخود کچ حەز دەکات جلی کوڕانە لەبەربکات و یاری بە ئۆتۆمبێل بکات. زۆر گرنگە لەوە بگەین کە ئەم کوڕە سێ چوار ساڵانەیە حەسودی بە کچ دەبات و حەز دەکات ئەمیش منداڵی ببێت، وەکو دایکی ئەم خواستانەی منداڵ لەزۆر کۆمەڵدا بەرەنگاری دەکرێت و ڕێنادرێت بەکوڕ شتی کچانە بکات. بەڵام بە ئاسانی ئەوە پەسەند دەکرێت کە کچێک یاری بە ئۆتۆمبێل بکات.دەبێت ئەوە بزانین کە زۆر ئاساییە کاتێک کوڕ دەیەوێت ببێت بە کچ و تاقی بکاتەوە، کچیش هەروەها، ئەم کردەوانە کاتییە و بەسەر دەچێت و منداڵ خۆی لەبیری دەچێتەوە. ئەگەر وازی لێبهێنرێت بە دەوری سروشتی خۆیدا بڕوات و شتەکە زۆر گرنگ نەکرێت لێی، چونکە بە بینینی ئەم دەورە منداڵ دەتوانێت زیاتر لە ڕۆڵی خۆی بگات، وەک پیاو یان ژن و کار ناکاتە سەر کەسایەتی منداڵەکە لەدواڕۆژ و ڕۆڵی خۆی بە باشی دەبینێ ئەوەی کە گرنگە ئەوانەن کە لە دەوروو پشتی منداڵەکەن .و منداڵ خۆیان پێ دەپێوێت

قۆناغی ئۆئیدیپال

لەسەرگوزشتەی یۆنانی کۆندا وا هاتووە، کە پاشایەک هەبووە بە ناوی(ئۆئیدۆپۆس) لە شاری ( تی بی) باوکی خۆی کوشتووە و پاشان دایکی مارە کردۆتەوە. لە زانستی شیکردنەوەی دەروونییدا ئەم هەستی دوژمنایەتییەی کوڕ بەرامبەر بە باوک، پێی دەوترێ

ئۆئیدیپال. سێ ساڵی یەکەمی منداڵ بریتییە: لە دروستبوونی پەیوەندی بەهێز لەگەڵ دایکیدا و هەر لەم قۆناغەدا گۆڕانێکی گەورە ڕوودەدات، ئەویش گرنگیدانی منداڵە بە دەورووپشتی کە دایک و باوکیش دەگرێتەوە. ئەم پەیوەندییە سێکۆچکەییە زۆر بەئاسانی دەبینرێ و زۆر دایک و باوک دەزانن کە منداڵەکەیان هەستی بەهێزی خۆشەویستی بەرانبەر هەردووکیان هەیە.( بەڵام لەم قۆناغەدا منداڵ دەیەوێت خۆشەویستی ئەو دایکە یان باوکەکە داگیربکات کە لەخۆی ناچێت)، بە مانای ئەوەی کچ بەرەو باوک و کوڕ بەرەو ڕووی خۆشەویستی دایک دەبێتەوە. بەمە دوژمنایەتی دروست دەبێت لەگەڵ ئەو لایەی کە لە منداڵەکە دەچێت، دوژمنایەتی کوڕ لەگەڵ باوک و دوژمنایەتی کچ لەگەڵ دایک، دەست پێدەکات ئەمە گیروگرفتێکی زۆر دەخاتە نێو دەروونی منداڵەکەوە، چونکە لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویستی ئەوی تریانی هەر ماوەو دەکەوێتە بارێکی زۆر نارەحەتەوە، ئەم نارەحەتییە دەبێت بەشێوەیەک چارەسەر بکرێت، لەبەرئەوەی هەر منداڵەی بە جۆرێک ئەم بارودۆخەی بەسەردا تێپەڕدەبێت، بۆیە چارەسەریش لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر دەگۆڕێت و کارێکی گەورەش دەکاتە سەر پاشەڕۆژی منداڵەکە. لەبەراوردکردنی ئەم هەموو هەستانە و بەیارمەتی و کۆمەککردنی دایک و باوکەکە، منداڵەکە دەتوانێت بەم قۆناغی پێشکەوتنەدا سەربکەوێت و بەو گۆڕانانەدا تێپەڕێت کە لەڕووی هەست و نەست و خۆشەویستییەوە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە و بناغەی مرۆڤێکی سەربەست و ئازاد دابنێ.

## خۆشەویستی ئۆئیدیپالی کچ

لە تەمەنی سێ ساڵی و بەرەو ژوور، کچ ڕووی خۆی بەرەو لای باوک وەردەگێڕێ، کاتێک کەبۆی دەردەکەوێت کە ئەم وەکو براکەی(ئەندامی پیاوانەی هەیە). جا ئیتر خەتای ئەم جیاوازییە دەخاتە ئەستۆی دایکی و بۆئەوەی ئەم جیاوازییە و ئەو بۆشاییە دەروونییەی نێو خۆی پڕ بکاتەوە، خۆی لە باوک نزیک دەخاتەوە. (پەیوەندی ئافرەت لە دواڕۆژدا لەگەڵ پیاو دەگەڕێتەوە بۆ ئەم پەیوەندییەی نێوانی کچ و باوک و چۆنیەتی ڕەفتارکردنی باوک بەرانبەر بەم خۆشەویستییەی کچ). بەشێوەیەکی گشتی بۆ باوک ئاسانترە کە نەرمونیانی پیشانی کچەکەی بدات وەک لە کوڕەکەی، لەم قۆناغەدا کچەکە باوکی هەر بۆ خۆی دەوێت و هیوای وایە کە باوکەکە هەر گرینگی بەو بدات و بەبێ سنوور بیر لە پیلاندانان دەکاتەوە کە خۆی زیاتر لەو نزیک بخاتەوە. دەبینیت کچەکە پرسیار دەکات:(دایە کەی دەڕۆیت بۆئەوەی من خزمەتی بابە بکەم!) هەر لەوانەیە پرسیار بکات، (کەی دایکی دەمرێت و ئەم شوێنی دەگرێتەوە).

## منداڵەکەت کاتێ قسەی وا دەکات چی دەوێت؟

بە کورتییەکەی دەیەوێت هەمان خۆشەویستی دەست بکەوێت، کە دایکی هەیەتی و دەیەوێت باوکەکە تەنها بۆخۆی بێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ماوەی سێ ساڵی ڕابردوودا دایکی یەکەم کەس بووە، کە ڕاستەوخۆ بەخێویکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەست بە دوژمنایەتییەک دەکات لەگەڵیدا. لە ساڵانی داهاتوودا منداڵەکە تێدەگات کە ناتوانێ بە تەواوی باوکی بۆ خۆی بێت و باوکیش هەرگیز ئەم خواستەی ئەوی بە ڕاست نەزانیوەو جێگای دایک و باوک و منداڵ لە خێزاندا جیاوازە و بۆئەوەی ئیتر زیاتر دایکی تووڕە نەکات و زیاتر لە دایکی دوور نەکەوێتەوە بڕیاری ئەوە دەدات کە ناتوانێت لە دایکی بچێت و وەکو دایکی بکات، چونکە ئەمیش ڕۆژێک لەڕۆژان وەکو دایکی دەبێت بە ژنێکی گەورە و شوو دەکات. ئەم پەیوەندییە لە پڕێکا تەواو نابێت، بەڵکو تا تەمەنی گەنجێتی و ڕەنگە زۆرجاریش تا تەمەنی ژنێتیش ئەم ئاواتانە هەر بەردەوام بن و جارجار ون بن و جارجار بگەڕێنەوە. لەگەڵ خەستبوونەوەو زیاتر تێگەیشتنیشدا لەو پەیوەندییە، کەچی کچ زۆرجار هەر دەیەوێت بە (کچە بچکۆلەکەی بابە!) ناوببرێت، زۆربەی کچان زۆر دوورتریش دەڕۆن، زۆر خەیاڵی جیاوازیان هەیە کە لەگەڵ باوکیان یەک ناگرێتەوە، کەچی زۆرجار خۆی بە باڵای باوکی دەپێوێت و دەیەوێت لەمزۆر ڕووەوە لەو بچێت: ( باوکم کچێکی خۆش دەوێت کە بە دەنگی نزم قسە بکات).( وا مەکە چونکە باوکم پێی خۆش نییە).(باوکم حەز دەکات بیم بە دکتۆر) هەر ئەمەش وای لێدەکات خۆی لەهەندێ ڕەفتار دووربخاتەوەو هەندێکی تر بکات بە پیشە و خوی خۆی. کچ زۆر ڕێگا دەگرێتەبەر، بۆئەوەی بەسەر ئەم هەستانەدا سەرکەوێت و بڕیاری خۆی دەدات کە لەدواڕۆژدا شوو دەکات بە پیاوێک و منداڵی دەبێت و ئەمە لە دایکی دەچێت، یاخود بڕیار دەدات کە شوو نەکات و وەک باوکی دەست بەکار بکات و زۆر ڕێگای جیاوازی تر. لەکاتێکی وا ناسکدا لەوانەیە، کە بارەکە زیاتر ئاڵۆزی بۆ ئەم کچە بە لەدایکبوونی برایەکی بچکۆلە، کە هەموو لایەک گرنگی پێدەدەن و بەمجارێ ئەم کچە لەبیر دەچێتەوەو خۆی بە کەم دەزانێ و حەسوودی بە منداڵەکە دەبات و خۆی لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی دوور دەخاتەوەو ئیتر بەمجارێ لە کۆمەڵ دادەپچڕێت و تووشی نەخۆشی دەروونی دەبێت، کە لەوانەیە بە درێژایی ژیانی لەگەڵیدا بمێنێتەوە.

هەندێ ژن هەرگیز گەورە نابن و لەم هەستە ڕزگاریان نابێت، کچی وا هەیە کە هەرچەند تەواو گەورە بووە ، بەڵام هەر پێویستی بە باوکێک هەیە بۆخۆی کچی وا حەز دەکات کە وەکو ژن ڕەفتاری لەگەڵ بکرێت، بەڵام لە پەیوەندی(جنس)ی دەترسێ و ناتوانێ

مامەڵەی لەگەڵ بکات. زۆر ڕێگا هەیە بۆ چارەسەرکردنی ئەم تەنگوچەڵەمانە، کە بریتییە: لە چارەسەرکردنی هەست و دەروونی کچ بەرامبەر دایکی و نەهێشتنی دژایەتی نێوانیان لەسەر خۆشەویستی باوک، هەر منداڵەی بە ڕێگای خۆی چارە دەکات.

خۆشەویستی ئۆئیدیپالی کوڕ

لە تەمەنی سێ ساڵیدا کوڕ دەیەوێت دایک بۆ خۆی بێت و دوژمنایەتی باوکی دەکات، حەز بە هاوڕێیەتی دایکی دەکات و دەیەوێت کە لە باوکی ئازاتر و بەهێزتر بێت و هەرچی باوکی هەیەتی ئەمیش هەیبێت، ئەم منداڵە ئێستاش باوکی خۆش دەوێت، بەڵام حەز دەکات کە باوکی بڕوات و لەبەرچاو ونبێت. کاتێک منداڵێکی پێنج ساڵان بینی کە ئۆتۆمبێلی خۆڵەکە بەبەر دەرگاکەدا ڕۆیشت لە دایکی پرسی چی بکەین ئەگەر باوکم کەوتە ناوی؟ کاتێ باوک لە کار دێتەوە منداڵەکە باوەشی پێدا دەکات و لەهەمانکاتدا دەشیەوێت زۆرانێی لەگەڵدا بگرێت، هەستی منداڵەکە هەستێکی تێکەڵاوە و لە بارێکی ناخۆشیدایە، چونکە ئەم سێ چوار ساڵانیە بەشێوەیەکی خەیاڵاوی دەژی و زۆرجار لەڕاستییەوە دوور دەکەوێتەوە. ئەم منداڵە وا دەزانێت کە دایک و باوکی هەموو شتێک دەزانن، تەنانەت ئەم شتانەش کە ئەو بیریان لێدەکاتەوە، هەرچەندە منداڵەکە دەیەوێت باوکی ون بێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەیەوێت تەحەمولی بوونی ئەو پیاوە بە دەسەڵاتەش بکات و دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە باوکی دەزانێت ئەم بیر لەچی دەکاتەوەو خراپتریش لەوە ئەوەیە کە منداڵەکە کاتێک سەرپشک دەبێت لەوەی باوکی پێی زانی، لێی زویر دەبێت و سزای دەدات.

ئەم سزایەش لەم کاتەدا ئەوەیە کە ئەندامی زاوزێی لەناو دەچێت بۆچی؟

یەکەم: لەبەرئەوەی لەم نزیکانەدا بۆی دەرکەوتووە، کە ژن ئەم ئەندامەیان نییە، بەپێی ئەو بیرە سادەیەی منداڵ ئەمە نیشانەیەکە بۆئەوەی کە پیاو لەوانەیە ئەم ئەندامەی لە کیس بچێت.

دووەم: لەبەرئەوەی ئەم ئەندامە سەرچاوەی خۆشی و هەوەسێتی و ئەم منداڵە حەز دەکات یاری پێ بکات، بۆیە ترسی منداڵەکە لەوەیە کە باوکی تووڕە ببێت و ئەم ئەندامەی لێ بسێنێتەوە.

ئەم تەمەنە تەمەنێکی پڕ لە تەنگوچەڵەمەیە و منداڵ نیشانەی ئەم تەنگوچەڵەمانەی پێوە دیارە کە لەهەمانکاتدا نیشانەی پێشکەوتنە منداڵێکی 6 ساڵان زۆرجار خۆی لە کچ دەپارێزێ، هەتا زۆرجار نایەوێت دەستی بەر دەستی بکەوێت، بەتایبەتی کاتێ کە مامۆستا دەڵێت دەستی یەکتری بگرن و بازنەیەک دروست بکەن. لەهەمانکاتدا زۆر گرنگی بەو نیشانانە دەدات کە بە پیاوانە دەژمێردرێن وەکو وەرزش، سەربازی و پۆلیسی و ئاگرکوژێنەوە. لەم تەمەندا بۆی دەردەکەوێت کە بۆی ناکرێ، لەسەر خۆشەویستیی دایکی پێشبڕکێ لەگەڵ باوکیدا بکات. هەرچەندە ئەم زۆر حەز بە خۆشەویستی دایکی دەکات و چەند دایکیشی ئەمی خۆش دەوێت، بەڵام دایکی ئەم خۆشەویستییەی بەڕاستی نەگرتووە. هەروەکو کە کچ دەیەوێت لاسایی دایکی بکاتەوە، بۆئەوەی بەسەر ئەو تەنگوچەڵەمانەدا سەر بکەوێت، ڕۆلی پیاو دەبینێت و هیوادارە کە ڕۆژێ لەڕۆژان وەکو باوکی لێبێت و ژن بهێنێت.

لەم قۆناغی پێشکەوتنی هەست و نەست و دەروونییەدا منداڵ شتی بەنرخ بۆ خۆی دەکات بەیاسا، (جوان نییە قسەی ناشرین بکەیت) (منداڵ ویژدانێک بۆ خۆی دروست دەکات) ئەم ویژدانە نەگەییوە و زۆری دەوێت بۆئەوەی پێبگات. یەکێک لەو یاسایانەی شەش ساڵییەک ئەوەیە کە بەهیچ جۆرێک نابێت پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵیدا هەبێت، زۆرجار ئەوەندە دوور دەڕوات کە نابێت بەهیچ جۆرێک حەز لە کچ بکات و پەیوەندی لەگەڵ کچدا هەبێت و ناویان ببات. ئەم بارودۆخە گرانەی کوڕ ئاسانتر دەبێت بەهۆی پەیوەندییکردن بە پیاوانی دەورووپشتییەوە وەکو مامۆستا و خزم و خەڵکی تر. هەروەکو چۆن کچ بۆ چارەسەرکردنی ئەم تەنگوچەڵەمانە زۆر شێوەی جیاوازی هەیە، کوڕیش هەروەها.

باوکێک کە دەتوانێت تەحەمولی ئەم کردەوانەی منداڵەکەی بکات و بەزۆری زۆرداری منداڵەکە لەم کردەوانە دوور بخاتەوە یان زۆر بەکاربهێنێت و گاڵتە بە منداڵەکەی بکات یان هەڕەشەی لێبکات. (لاچۆ تۆ عەیب ناکەیت هەر لەلای ئێمە دانیشتووی، بچۆ بۆلای منداڵەکان.(ئەگەر وازم لێ نەهێنێ ئیتر باوکی تۆ نابم.) ئەمە دەبێت بەهۆی دواکەوتنی منداڵەکە و وای لێدێ کە ببێت بە مرۆڤێکی ترسنۆک و لاواز و شەرمن کە ناتوانآ بەرەنگاری کەس بێتەوە و وەک مرۆڤێکی تەواو دانیشێ قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکات. ئەم جۆرە منداڵە منداڵێکی پاسیڤ دەردەچێت و ناتوانێ بوونی خۆی بسەلمێنێت .

هەندێ کەس لەوانەیە لەم ڕۆڵەدا نەیەنە دەرەوە و زۆر پیاو هەیە کە تا ئێستاش هەر شەش ساڵانن و پێویستە بە چاوی سووک سەیری ژن بکەن و دەترسن لەو ترسەی ژن هەیەتی لەسەریان بەهۆی ئەو میراتە دەروونییەی کە هەر لە منداڵییەوە بۆیان ماوەتەوە، خۆیان لە هەر شتێک بۆنی ژنی لێوە بێت دووردەخەنەوە و ڕوو دەکەنە ئەو یارییانەی کە نیشانەی پیاوەتییان پێوەیە، وەک: فۆتبۆڵێن و یاری ئاسن و ڕقیان لە شتی ژنانە دەبێتەوە، وەک مۆسیقا و شانۆ و ... هتد. لەبەرئەوەی کە منداڵەکە دەترسێ لەوەی کە ئەندامی زاوزێی

زیانی پێبگات، لەبەرئەوە ئەم تەمەنە تەمەنێکی پڕ لە ئازارو ناخۆشییەوە و وا لە منداڵەکە دەکات بە توندی بەرهەڵستێ ئەم هەستانەی خۆی ببێتەوە، ئەم گۆڕانە وا لە منداڵەکە دەکەن کە خۆشەویستییەکەی بەرانبەر دایکی هەیەتی، ببڕێتەوە و زۆر ناخایەنێ، هەر لەبەرئەمەشە کە بە دەگمەن دەبینین کە پیاوێک ژنێک بهێنێ کە لەخۆی بەتەمەنتر بێت.

لە قۆناغی ئۆئیدیپاڵدا چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵدا دەکەین؟

لەم قۆناغەدا منداڵ بە زۆر جۆری جیاواز خەیاڵی خۆی دەردەبڕێ. سەرت سووڕ نەمێنێ کە منداڵەکەت بڕیاری وا سەیر دەدات کە تۆ پێکەنینت پێی دێت، کچەکەت لە پڕێک بڕیاری داوە خۆی ماڵەکە بەڕێوەبەرێت و داوا لە دایکی دەکات کە بڕوات بۆ شوێنێکی تر و لەبەرچاو ونبێت.

کوڕەکەت بڕیاری داوە ئیتر پێویستی بە باوکی نییە و زۆرجار هەر بە ئاشکرا دەچێت بەگژ باوکیدا و زۆرانی لەگەڵ دەگرێت و هەوڵدەدات کە بیدا بە زەویدا، لەبیرت نەچێت، کە کوڕەکەت لە تێکۆشانێکی سەخت دایە لەنێوانی دوو هەستدا، یەکەم خۆشەویستی باوکەکە و دووەم دوژمنایەتی و بەربەرەکانی کردنی، هەروەها کچەکەشت لە خۆشەویستی دایکەکە و دوژمنایەتی و بەربەرەکانیکردنیدا. منداڵەکەت لەگەڵ ئەم دایکە یان باوکەدا پێشبڕکێ دەکات و دەیەوێت بەسەریدا سەرکەوێت و لەهەمانکاتدا دەیەوێت خۆشەویستی ئەوی تریانی دەست بکەوێت و منداڵەکە باش دەزانێت کە خۆشەویستی هەردووکیان پێویستە لەهەمانکاتدا. لەم قۆناغەدا پێویستی سەرشانی دایک و باوک ئەوەیە کە نموونەیەکی ڕاست و پڕ خۆشەویستی بن بۆ منداڵەکە، جێگای متمانەو ڕێزی منداڵەکە بن، هەوڵ نەدەن کە گاڵتەی پآ بکەن ، کاتێ کە پێشنیازەکانی دەکات و هەروەها گرنگییەکی زۆریش نەدەن بە پێشنیاز و خەیاڵەکانی. باشتر وایە بۆی ڕوون بکەنەوە کە تۆی(دایک) ئەوت خۆش دەوێت، ئەویش ڕۆژێک لەڕۆژان گەورە دەبێت و ژنێک دێنێ لە تەمەنی خۆیدا. هەروەها باوکەکە تووڕە نەبێت بەوەی کوڕەکەی ئەیەوێت زۆرانێی لەگەڵدا بگرێت و بیدات بە زەویدا و جاری واش هەیە، شەقیش دەهاوێژێت و خراپتریش دەکات، باشتر وایە کە بۆی ڕوون بکەیتەوە کە ڕۆژێ لەڕۆژان ئەویش گەورە و بەهێز دەبێت و لەوانەیە لە باوکی بەهێزتریش بێت و زۆرانێش لەگەڵ منداڵەکەیدا بگرێت، بەڵام وریای ئەوە بە، کە هەموو جارێک منداڵەکەت نەدەیت بە زەویدا، چونکە وا لە منداڵەکە دەکات کە بڕوای بەخۆی نەمێنێ و وابزانێ کە هەرگیز ئەم ناتوانێ وەکو تۆ گەورەو بەهێز ببێت.

لەم تەمەنەدا پێویستە وەکو نموونەیەکی گەورە بۆ منداڵ بسەلمێنرێت کە ئەویش پێویستە ببێت بە پیاو، ڕۆژێ لەڕۆژان ئەو پەیوەندییە بەهێزەی هەیە لە نێوانیاندا دەپچڕێ.(دایک و باوک یەکەم خۆشەویستی ڕاستەقینەی منداڵن و چۆن ئەم قۆناغە بەسەر دەبەن پێکەوە، ئەوا کار دەکاتە سەر هەموو پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی منداڵەکە لەدواڕۆژدا )

ویژدانی منداڵ

لەم تەمەنەدا گۆڕانی گەورە لە مێشکی منداڵدا ڕوودەدات، کە دەبێتە هۆی گۆڕینی پەیوەندی بە دایک و باوکەوە و بە چاوێکی تر سەیری ژیان و توانای خۆی دەکات. یەکێک لەم گۆڕانانە ئەوەیە کە منداڵ زیاتر لە دایک و باوک دەچێت لەبارەی ئەوەی کە ئەوان چیان پێ خۆشە و چییان پێ ناخۆشە، ئەمیش هەروەکو ئەوان وایە و حەزدەکات کە لەوان بچێت و لاساییان دەکاتەوە. بەمە بناغەی ویژدا بۆ منداڵ دروست دەبێت، لەم تەمەنەدا منداڵ پەیوەندی ڕەوشتی دایک و باوک بەهی خۆی بەراورد دەکات و هەوڵدەدات کە پێشی بخات، ئەو شتانەی (شتی باش) کە بۆی هەیە بیانکات و ئەو شتانەی بۆی نییە(شتی خراپ) بیانکات دەکات بە دەستووری خۆی و لەسەریان دەڕوات. لەبەرئەوەی کە ئێستا ویژدانی منداڵەکە پێشکەوتووە، لەبەرئەوەی ئێستا یاسایەکی هەیە. گەر هەست و بیر کردەوەکان دژی ئەم یاسایە بن، بەتوندی دژیان دەوەستێتەوە، ئێستا منداڵ هەست بە خەتا دەکات. لە تەمەنی 6 ساڵیدا، ویژدانی منداڵ زۆر توندو تیژە زۆر بەتوندی دەست بەو دەستوورەوە دەگرێت کە بۆخۆی دروستکردووە و هیچ ڕێگای گفتوگۆ نادات، ئەمە بۆ منداڵێکی 6 ساڵان شتێکی ئاساییە و پێویست ناکات خۆت دڵگیر بکەیت یاخود زۆری لێ بکەیت کە وازیان لێبهێنێ، بەڵام ئەگەر منداڵ بەردەوام بوو لە توندوتیژی و دەستگرتن بەم یاسایانەوە و هەر کارێک کە کردی و سەرنەکەت خەتاکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ خۆی، ئەوە نیشانەیەکی باش نییە و منداڵەکە ناتوانێ لە دواڕۆژدا بەشێوەیەکی چالاک بەشداری ژیانی کۆمەڵایەتی بکات.

دایک و باوک لەتەمەنی چوونە قوتابخانەدا هەست بەم ویژدانە توندوتیژە دەکەن. کاتێک کە منداڵەکەیان نایەوێت لەگەڵ قوتابیانی تر بەشداری یاری و ژیانی قوتابخانە بکات، لەبەرئەوەی کە زۆرجار هەڵە ڕوودەدات و هەڵەکەش گوناهی ئەمە.

وەکو دایک و باوک دەبێت ئاگاداری ئەوە بین کە ئایا منداڵەکەمان زیاد لە پێویست دەست بە یاساکانییەوە دەگرێت یان نا، زۆرجار دەبینین کە منداڵ ڕۆژی چەند جارێک خۆی دەشوات، یاخود هەموو شەوێک جلەکانی بە جۆرێکی تایبەتی ڕێکدەخات و زۆر کاری تر کە دووبارە دەبێتەوە و بەبێ ئەوەی کە منداڵەکە بەقەدەر موویەک لێی لابدات.

ویژدانی منداڵ ورده ورده پێشدەکەوێت و منداڵ حەز دەکات کە شتی تازە فێر ببێت، و لە ژیاندا نموونەی وا دەبینێت کە جیاوازە لەوەی کە لە مێشکی خۆیدا دروستی کردوون، و بەوەی کە بەراوردی دەورووپشتی خۆی بکات لەگەڵ یەکتریدا ئێتر دەستوور و ویژدانی منداڵیش دەگۆڕێ بەم پێیە و بۆی دەردەکەوێت کە زۆر ڕێگا هەیە بۆ بەشداربوون لە ژیانی ڕۆژانەدا لە دەربڕینی هەست و خواستەکانی.

هەندێ لە تەنگوچەڵەمەکانی ئەم قۆناغە

1- ترساندنی منداڵ بەخێو و دێو و درنج ...

لەم قۆناغەدا منداڵ لە زۆر شت دەترسێ، خێو ، دێو ، جنۆکە ، دز ، سەگ ، پڵنگ، شێر ، مێشوولە و شەو لەبان و هتد ... .

ئەگەر لەبیرمان بێت کە منداڵێک لە هەستێکی دوو جەمسەریدا (خۆشەویستی و ڕق) دا بەرامبەر باوکی بژی، ئەوا حەز دەکات باوکی نەمێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا حەز دەکات وەکو ئەو بێت و دەترسێ لەوەی کە باوکی پێی بزانێت کە ئەم چۆن بیر دەکاتەوە، چی دەکات؟ ئایا منداڵێک لە دەست ئەم هەموو هەست و بیرە بەهێزانەدا چۆن بتوانێت خۆی ڕزگار بکات و سەربکەوێت؟

بۆ منداڵێک زۆر گرانە لەگەڵ یەکێکدا بژی کە زۆر لێی دەترسێ (باوکی) ئەگەر ئەم دوژمنایەتییە بخاتە سەر کەسێکی تر یان شتێکی تر ئەوا ئێتر پێویستی بەوە نییە خۆی لەدەست باوکی ڕزگار بکات.

منداڵەکە لە پڕێکا دەترسێ کە سەگێک گازی لێدەگرێت یاخود دێوێکی گەورە دێت و دەیبات، یاخود ناتوانێ بنوێ، چونکە ژوورەکەی خێوی لێیە، بەبێ ئەوەی منداڵەکە بەخۆی بزانێ تۆڵەکردنەوەو ترسی باوکەکە دراوە بەیەکێکی تر کە ئەم منداڵە بە ئاسانی دەتوانێت خۆی لێ بپارێزێ، ئەو ناتوانێ خۆی بپارێزێ لە باوکەکە، بەڵام بەئاسانی دەتوانێت خۆی بپارێزێ لە سەگی دراوسێیەکەیان و بەوێدا نەڕوات، یاخود زۆر لە دایکی بکات کە تا خەوی لێدەکەوێ لایەوە بێت و لەخێوەکە ڕزگاری دەبێت، جا بەمە کە ئەم منداڵە دەتوانێت خۆی لەمانە دوورخاتەوە کە لە جیاتی باوکین ئەوا ژیان ئاسانتر دەبێت بۆی.

خەوی ناخۆش و ترسی ئەم تەمەنە بریتییە لە هەوڵدان بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات لەم هەموو و هەستە دوو جەمسەرانە. ترسێک ون دەبێت و ترسێکی تر سەر هەڵدەدا، سەغڵەت مەبە بەوەی منداڵەکەت هەندێجار زۆر زیاد لە پێویست لە شتێک دەترسێ، پێی بڵێیت کە دەبێت دەستی لێ بدات، چونکە ئەمە ڕاست نییەو دەبێت بەهۆی بەهێزکردنی هەستی منداڵەکە، ئەمجۆرە ترسانە کاتییە و لە قۆناغی داهاتوودا بەسەر دەچێت و لەبیر دەچێتەوەو نامێنێ. با وادابنێین ڕۆژێ لەڕۆژان منداڵەکەت تووشی سەگێک یان پشیلەیەک بوو و دەستی کرد بە زریکاندن و ترسی لێ نیشت. ئایا چی دەکەیت؟

لەکاتی وادا پێویست بە سەر لەخۆ شێواندان ناکات و بەبێ ئەوەی کە هیچ شڵەژانێک پیشان بدەیت و ڕابکەیت بۆ پێشەوە بۆ ڕزگارکردنی منداڵەکە و دەستی بگرێت و ڕایکێشیتە دواوە، کە ئەمە ئەوەندەی تر ترسەکەی زیاد دەکات، بەڵکو دەبێت لەسەرخۆ و بە ئەسپایی بچێتە پێشەوە بۆلای منداڵەکە و بیگریتە باوەش و دڵنەوایی بکەیت و پێی بڵێیت کە هەقی بوو کە ترسا و نابێت هەوڵبدەیت کە بۆی بسەڵمێنیت کە ئەمە ترسناک نییە و نابێت زۆری لێ بکەیت کە بچێت دەست لە سەگەکە بدات و کاتێ گەیشتیتە لای منداڵەکە دەبێت زۆر لەسەرخۆ لەو شوێنە لاچیت و بۆی باس بکەیت کە ئێتر پێویست بەوە ناکات بترسێت و سەگەکە زۆر ترسناک نییە و نایەوێت گاز لەم بگرێت و خۆشی لە ترساندا دەوەڕێت.

هەروەها بۆ هەموو ئەو شتانەش کە منداڵ لە مێشکی خۆیدا دروستی کردوون، یا لە گەورەکانی بیستووە، باشتر وایە کە باسیان بکەیت لەگەڵ منداڵدا و سەرگوزشتەی وا بۆ منداڵەکە بگێڕێتەوە دەریخات ئەم شتانە هیچ نین و لەڕاستیدا شتێکی تر یان کەسێکی تر بوو کە خۆی گۆڕی بوو، زۆرجار یارییەکی کوردەواری هەیە کە یەکێک خۆی دەکات بەخێو و جلی سپی لەبەردەکات و دێتە ژوورەوە و دەیەوێت منداڵان بترسێنێ، ئەمە یارییەکی باشە و منداڵ بۆی دەردەکەوێت کە یەکێک لە براکانی یاخود خوشکە گەورەکەی بوو کە ببوو بەخێو، هەروەها زۆر یاری تر کە پێویستە پەرەیان پێبدرێت و واز لەو کردەوانە بهێنرێنێت کە دەبن بەهۆی ترسانی منداڵ بەخێو و دێو و درنج، بۆئەوەی نەچێتە ژوورە تاریکەکەوە و نەختێ مێوژی قرپۆک بخوات، یاخود هەر لەسەر حسابی منداڵەکە پێکەنین دروست بکرێت و پاڵ بە منداڵەکەوە بنرێت بۆلای ئەو شتەی کە لێی دەترسێت، ئەمانە کارێکی زۆر ناهەموارن بەرانبەر بە منداڵ و کارێکی خراپ دەکەنە سەر هەموو ژیانی لە داهاتوودا.

........................................... درۆکردن ..........

خەیاڵی منداڵێکی سێ چوار ساڵان زۆرجار دوور دەڕوات و دەفڕێ. جیهانی منداڵ جیهانێکە لە (خەیاڵ و ڕاستی) پێکهاتووە، دایکو باوک نازانن جیهانی منداڵ چەندە بەرتەسکە و چۆن بە ئاسانی کاری تێدەکرێت. بە ئاسانی تووڕە دەبن چونکە وا دەزانن کە

منداڵەکەیان تووشی نەخۆشی درۆزنی بووە. لە ڕاستیدا درۆ زۆر جۆری هەیە . هەندێ لەو درۆیانە سامناکن و ئامانجی باشیان لێ ناکەوێتەوە و هەندێکی تریان نیشانەی ئەوەن کە منداڵەکە تەنگوچەڵەمەی هەیە و ئەم درۆیانە هاوارێکە بۆ یارمەتی.
درۆی سێ چوار ساڵان لەوە دەچێت کە هەوڵدانێکی منداڵەکە بێت بۆ گۆڕینی ئەو باروودۆخەی کە هەیە بۆ بارێکی باشتر کە بە دڵی منداڵەکە بێت. منداڵێک جاری وا هەیە سەرگوزشتەی سەیر دەگێڕێتەوە. هەر لەبەرئەوەی سەرنجی دەووروووبەرەکەی ڕابکێشێت بۆ لای خۆی وابکات کە ستایش بکرێت، لە سنوورێکی دیاردا ئەم درۆیانە زیانیان نییە و پێویست بە هیچ دڵگیرییەک ناکات، بەڵام ئەگەر درۆکان زیادیان کرد و منداڵەکە هەموو ئیشی بوو بەوەی سەرگوزشتەی سەیرو سەمەرە بگێڕێتەوە ، ئەوا نیشانەی ئەوەیە کە منداڵەکە پێویستی بە خۆشەویستییە و دەبێت زیاتر گرنگی پێ بدرێ.
منداڵ هەمووکات هەوڵدەدات دەورووبەرەکەی تاقیبکاتەوە و بۆ ئەمە ڕاستی دەگۆڕێت و ناشی شارێتەوە کە درۆ دەکات، لەبەرئەوە دەبینیت درۆکەی یەکجار گەورەیە. چونکە منداڵ لەم تەمەنەدا وا دەزانی و بڕوای وایە کە باوکودایکی هەموو شتێک دەزانن و بۆ تاقیکردنەوەی ئەمەش پێویستە بیسەلمێنێ کە وایە لەبەرئەوە درۆ دەکات بۆئەوەی سەرپشک بێت لەم بیروڕایەی خۆی.
چۆن ڕەفتار لەگەڵ ئەم درۆیانە دەکەین، کارێکی تەواو دەکاتە سەر هەڵسوکەوتی منداڵ لەگەڵ مامۆستا و هاوڕێ و کەسانی تردا لە ئێستا و لە دواڕۆژدا. کاتێ کە زانیت منداڵەکەت درۆ دەکات، پێویستە بەبێ دەمارگیریی و لەسەرخۆ ڕەفتاری لەگەڵ بکەیت، پێی بڵێیت کە بڕوا ناکەیت و ڕاستی کارەکەت لاباشە کە بیگێڕێتەوە و دەزانێت کە ئەم زۆرجار ڕاست قسە دەکات. تووڕەبوون و خۆ گرژکردن لەم کاتەدا هیچ سوودی نییە و کارەکە زیاتر خراپ ئەکات و زیاتر لە نرخی منداڵەکە کەم دەکاتەوە لە بری ئەوەی کە چارێکی ئەم گیرو گرفتە بکەیت
خۆ ئەگەر منداڵەکە دانی بە هەڵەکەیدا نا ئەوە باشترین شت ئەوەیە کە پێی بڵێیت دڵخۆش بوویت و شادمان بوویت بەوەی ئەو ئێستا ڕاستەکەی دەربڕی و بۆی باس بکەیت بۆچی هەڵە بوو کە ئەو درۆی کرد.
(لەپەرتوکی منداڵەکەت بۆ وا ئەکات..... ماویەتی)

:ئەو هەڵانەی لەگەڵ منداڵدا دەکرێت و دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ درۆ بکات -3
هەمووومان دیومانەو ڕووبەڕووی ئەو پەروەردە هەڵەیە بووینەتەوە کە گەورەکان لەگەڵ منداڵی ساوادا بەکاری دەهێنن.( هەر کە منداڵەکە چاوی کردەوە. دایک و باوک دەست دەکەن بە گڕە گڕ و تڕە تڕ و قڕە قڕ..) لەکاتی دواندنی منداڵەکەدا بەو نیازەی کە گوایا ئەمانە دڵی منداڵەکە خۆش دەکەن و گوێی دەکەنەوە، نازانن کە ئەم ڕەفتارەیان هەر لە ئێستاوە شتێکی ناهەموارە بەرانبەر بەم ساوایەو باشتر وایە لەجیاتی ئەم دەنگە ناخۆشانە چەند وشەیەکی ڕێکوپێک بەکاربهێنن و هەر لە ئێستاوە گوێی منداڵەکە بە وشەی ڕاست بکەنەوە لە .بری ئەم وشانە کە هیچ مانایەکیان نییە

هەر لێرەوە دەتوانین منداڵ فێری وشە بکەین و فێری ئەوەی بکەین کە جیاوازی لە نێوانی (بچووک، گەورەو گەورەتر..) (بەرز، بەرزتر و بەرزترین ) دا هەیە، بۆئەوەی بتوانێ لە دواڕۆژدا بە تەواوی ئەم وشانە لێک جیابکاتەوە و بەکاریان بهێنێ، چونکە یەکێک لەو شتانەی بە درۆ دەژمێردرێت ئەوەیە کە منداڵ ناتوانێت بە (ڕێژەیەکی گونجاو) (ئاوەڵناو) بەکاربهێنێت و هەتا کە گەورەش دەبێت هەر ئەم کەموکورییەی لەگەڵدا دەمێنێتەوەو بە جۆرێک کە دەبیستێت خەڵکی قسە دەکات یان ئەوەیە زۆر چاکە یان زۆر خراپ، زۆر .پیاو خراپە یان زۆر پیاوێکی چاک، کەسێک نییە بڵێت ئەم مرۆڤە لە ئیمڕۆدا باشە و نازانرێت سبەینێ چی بەسەردێت

هەڵەیەکی تری گەورەکان بەکارهێنانی پەیمانی درۆیە لەگەڵ منداڵدا، هەر کە منداڵەکە گریا، ئیتر بە پەیمانی درۆ دەیانەوێت ژێری بکەنەوە، دوایی شەربەتت بۆ دەکەم بڕۆ بۆ ماڵەوە دوایی جلت بۆ دەکڕم، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە و ئەنجامێکی خراپی هەیە و پێویستە لەسەر دایک و باوک و پەروەردەکاران کە لە درۆکردن و پەیمانی درۆ دووربکەونەوە، چونکە ئەمە دەبێت بەهۆی نەمانی ڕێز لە .نێوانی منداڵ و گەورەکاندا و ئیتر منداڵ بۆی دەردەکەوێت کە گەورەکان ئەوەندە پیرۆز نین کە ئەو لای وایە

دیارە کە منداڵ لەم تەمەنەدا هەموو ئیعتمادێکی لەسەر دایک و باوکێتی و کاتێک کە ئەوان دیار نامێنن ئیتر ئەم دەست بە گریان دەکات، ئەمە گیروگرفتی هەموو خێزانێکە و هەموو منداڵێک لە ونبوونی دایک و باوکی دەترسێت، بابزانین چۆن ئەم تەنگوچەڵەمەیە لەلای خۆمان، چارەسەر دەکرێت؟

هەرکە باوک یان دایک ڕۆیشتە دەرەوە ئیتر ئەمە درۆیە و لەگەڵ منداڵدا دەکرێت و منداڵیش دەگری، ئێستا بابە دێتەوە، بابە چوو بۆ ئاودەست، بابە چوو بۆ سەربان، بابە چوو شیرینیت بۆ بکڕێت، ئیتر هەموو شتێک بێجگە لە ڕاستییەکەی بەم منداڵە دەوترێت، بابە پێویستە بچێت بۆ کاری خۆی و پارە پەیدا بکات بۆئەوەی بتوانین نان و خواردن بکڕین و ئێوارە دێتەوە بۆ لامان، چونکە ئەو ئێمەی خۆش دەوێت و هەر جارێک دەچێت بۆ کار دوای تەواوبوونی دێتەوە، بەم ڕاستییە منداڵەکە دڵخۆش دەبێت و دەزانێت کە باوکی نەڕۆیشتووە بۆئەوەی (ون ببێت)چونکە ئەو لەوە دەترسێ و بۆ ئەوە ناگری کە باوکی شیرینی بۆ بێنێت. جا ئەمەیە کە بناغەی ڕاستی دادەنێ بۆ منداڵ و لەسەر ئەوە ڕایدەهێنێت کە بڕوا بە گەورەکان بکات و وای لێدەکات کە ئەویش لای خۆیەوە درۆ لەگەڵ گەورەکان .نەکات

لە ئەنجامی درۆکانمدا لەگەڵ منداڵدا تەنها ئەوەمان بۆ دەمێنێتەوە کە لە دواڕۆژدا ئێمەش بڕوا بە منداڵەکانمان دەکەین و گوناهیش گوناهی خۆمانە، منداڵێک کە بە درۆ لەگەڵ کردن گەورە کرا، لەوە زیاتر کە درۆمان لەگەڵ بکات، چاوەڕوانی هیچی تری لێ ناکرێت.

بڕوا نەکردنی ئێمە بە یەکتر و درۆ دەلەسەمان لێرەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە و دەبێت لێرەشەوە چارەسەر بکرێت، ئەویش تەنها بە پەروەردەیەکی ڕاست و بێ درۆ دەلەسە، لەگەڵ منداڵی ساوادا دەتوانرێت کۆمەڵێکی ڕاستگۆ دروست بکرێت.

جا باشتر وایە لە ئێستاوە بەڕاستی لەگەڵ ساواکانماندا ڕەفتار بکەین و درۆیان لەگەڵ نەکەین، منداڵ ئەوە ناکات کە تۆ پێی دەڵێیت، ئەوە دەکات کە تۆ دەیکەیت، جا باشتر ئەوەیە بۆی باس بکەیت کە بابە دەڕوات بۆ ئیش و دێتەوە (ئەگەر باوکەکە یان دایکەکە مرد، ئەمە باسێکی ترە.) باشتر وایە هەر لە منداڵییەوە کە بەدوای دایکی یان باوکیدا گریا، بگیریتە باوەش و ڕێی پێبدرێت هەر لە دەرگاکەوە خواحافیزی لە باوکی یان لە دایکی بکات، بۆی باسبکرێت کە ئێوارە دێتەوە .( ئێوارە کە دنیا تاریک بوو، یان کە دەستمان کرد بە نانخواردن، یاخود کە سارد بوو.) ئەمە بە چەند جارێک دووبارەکردنەوە دوایی دێت و منداڵەکەش هەرگیز بە دوایی باوکیدا ناگری و وای لێدێت کە خۆی دەچێت دەرگاکە بۆ باوکی دەکاتەوە و دەڵێت خوا حافیز.

جا بەمە خۆشمان و منداڵەکەشمان لە درۆکردن دەپارێزین. هەر یەکێ لە ئێمە گەر بیر لە ژیانی ڕابردووی خۆی بکاتەوە، دێتەوە بیری کە چۆن گەورەیەک لە گەورەکان یان زۆربەمان وەڵامی هەموو شتێکیان پێبوو، هەموو شتێکیشمان دەزانی. هەر پرسیارت لێبکردنایە، ئەوا شارەزایی تەواویان هەبوو و هەر زووش وەڵامیان دەدایتەوە، منداڵ لەم تەمەنەدا پرسیار لەهەموو شتێک دەکات و وەڵامی بۆ هەموو شتێکیش دەوێت. جا لێرەدا بیرمانە، کە چۆن هەندآ لە گەورەکان وەڵامیان دەداینەوە و ئێمەش تا ڕاددەیەک بە وەڵامەکانیان ڕازی دەبووین، بەڵام کە گەورەتر بووین، ئێتر بۆمان دەرکەوت وەڵامەکانی زۆریان ڕاست نەبوون و ئەم گەورانە لە خۆیانەوە زانیاری چەوتیان دەخستە مێشکمانەوە، یاخود لەبەرئەوەی خۆیان ڕزگاربکەن لە پرسیارەکان وەڵامێکی وایان دەداینەوەو دەمکوتیان دەکردین، ئەمە ئەنجاکی خراپە و دەبێت بەهۆی ئەوەی منداڵیش لەخۆیەوە وەڵام درست بکات و خۆی وا دەرخات کە هەموو شتێک دەزانێت، چونکە دەترسێ لەوەی گەورەکان بە کەم سەیری بکەن. باشتر وایە لە کاتێکی وادا منداڵ کە پرسیار دەکات و گەورەکان وەڵامی نازانن، بە ئاشکرا پێی بڵێن کە نازانین و کەسیش نییە وەڵامی هەموو پرسیارێک بزانێت جا باشتر وایە:

ڕ- ئەگەر توانیت بەڕاستی وەڵامی پرسیارەکە بدەیتەوە، ئەوە باشە.

ب- کە وەڵامەکە نازانیت، بڵێیت نازانم باشترە و دەتوانیت لە پەرتووکێک بۆی بگەڕێیت یان لە مامۆستای شارەزا پرسیار بکەیت. خۆشت یارمەتی بدەیت وەڵامە ڕاستەکەی دەستکەوێت.

لەدواییدا دەبێت بڵێین کە:

1- هەرگیز نابێت لەگەڵ منداڵدا درۆ بکرێت، لەژێر هەر بارو دۆخ و بڕوبیانوێکدا یان لەهەرکاتێکدا بێت.

2- تەنها بە پەروەردەکردنێکی ڕاستگۆ دەتوانرێت منداڵی ساواو کۆمەڵێکی بەختیار دروست بکرێت.

4- میزکردن لەناو جێگادا:

میزکردن بەخۆدا و میز لەناو جێگادا کردن، گرفتێکی ناخۆشە بۆ خێزان، کە نازانێت چی بکات، منداڵیش لە ترسی ئەوەی کە هەرجار میزی کرد بەخۆیدا دایک و باوکی دڵیان لێی نەیەشێت، زۆرجار دەیشارێتەوە، هەروەها ترسی ئەوەی هەیە هاوڕێکانی پێی بزانن و توانج و تەلاری لێبدەن. زۆر پشکنین کراوە لەسەر ئەم باسە و تا ئێستا بە تەواوی نازانرێت هۆی ئەمە چییە، بۆیە ئەگەر درێژەی کێشا پێویست بە ئامۆژگاری دکتۆر دەکات، بەڵام زۆربەی کات ئەم خووە ئاساییە و کاتێک منداڵ گەورەتر دەبێت نایمێنێت، چونکە ئیتر منداڵ لە تەمەنی(8- 9) ساڵیدا دەتوانێت دەست بەسەر میزەڵانیدا بگرێت و لەکاتی نووستندا خەبەری بێتەوە و بچێت بۆ ئاودەست، لەبارێکی تردا منداڵ ناتوانێت و بەدەست خۆی نییە کە میز لە جێگاکەیدا بەخۆیدا دەکات چی بکەین؟

زۆر ڕێگا هەیە بۆ یارمەتیدانی منداڵ و ڕزگارکردنی لەم گرفتە کە زۆرجار خۆی زیاتر لە دایک و باوک پێ ناخۆشە.

لەبیرت نەچێت هەموو منداڵێک جارێک لەجاران لەناو جێگاکەیدا میز بەخۆیدا دەکات و ئەمە گرفتێکی زۆر گەورە نییە و نابێت وا لە منداڵ بکرێت کە شەرم لەخۆی بکاتەوە و دەبێت پێی بوترێت: ئەمە شتێکی ئاساییە و هەموو منداڵێک تووشی ئەمە دەبێت و کە گەورەتربوو ئیتر ئەمەی نامێنێت. باشتر وایە بۆ شەوی دواتر پێش نووستن کەمتر ئاوو شلەمەنی بخواتەوەو پێش ئەوەی خۆت بەخەویت منداڵەکە خەبەرکەیتەوە بۆ میزکردن، هەروەها ئەم باس و گفتوگۆیە دەبێت لە نێوانی منداڵەکەو دایکیدا بێت و نەکرێت و بەبنێشتە خۆشەی خێزانەکە و هەوڵبدرێت هۆی میزکردنەکە بزانرێت، لەوانەیە پەیوەندی بە باری کۆمەڵایەتی خێزانەکەوە هەبێت،

یاخود مردنی کەسێک یان ونبوونی ئەندامێک لە ئەندامەکانی خێزانەکە، یان بەهۆی لەدایکبوونی منداڵێکی تازە یان جیابوونەوەی دایک و باوکەوە، دەبێت هەوڵبدرێت لەو بارەیەوە قسە لەگەڵ منداڵەکەدا بکرێت، هەروەها ئەو شەوەی کە منداڵەکە خۆی پیس ناکات، پێ بووترێت و خۆشحاڵی بۆ دەرببڕێت و ئافەرین بکرێت، دڵنەوایی بکرێت بە ماچێک یان بە باسکردنی شتێکی خۆش یان سەیرانێک کە پێکەوە لەگەڵ خێزانەکەدا ئەنجامی دەدەن.

بۆ پێشکەوتن و فێربوونی زمان چۆن یارمەتی منداڵ دەدەین؟

زۆر ڕێگا هەیە بۆئەوەی یارمەتی منداڵ بدرێت، زمانی پێش بکەوێت و بەهۆی ئەم پێشکەوتنەوە بتوانێت هەنگاوی تر لەژیاندا بنێت، چونکە زمان چەکێکی کاریگەرە لەدواڕۆژی منداڵدا و زۆرجار ئەم ڕاستییە پشتگوێ دەخرێت، کاتێ منداڵ دەتوانێت ئەم چەکە بەکاربهێنێت، ناچار پەنا دەباتە بەر چەکی دەست و قاچ و هێزی بازوو بەکارهێنان، چونکە زیاتر ڕاهێنانی بەمانە کردووە، زۆر زەحمەتە منداڵێک هەڵخەڵەتێنرێت کە چەکی زمانی هەبێت و لە بەکارهێنانیدا کارامە بێت، بۆیە باشترە هەر لە ئێستاوە هەوڵبدرێت کە منداڵ بیربکاتەوەو زمان بەکاربهێنێت بۆ بیرکردنەوە، ئەمەش بەوەی ڕێگای بدەیت قسە بکات و قسەی پێ نەبڕدرێت و قسەی لەگەڵدا بکرێت، دەبێت ئەحەمولت هەبێت و قسە بۆ منداڵ نەکەیت و وازی لێبهێنێت خۆی بیربکاتەوە و قسەکەی بکات، کە پرسیاری لێدەکەیت چاوەڕوان بکەیت و پەلەی لێ نەکەیت. پرسیارەکانت دەبێت کورت و ئاسان بێت وەکو ئیمڕۆ چیت کرد لەگەڵ هاوڕێکەت؟ کێت بینی؟ چیت خوارد؟ چیت لە دەستایە؟ لەدوای ئەوەی پرسیارێکت لێکرد چاوەڕوان بکەیت بۆ وەڵام، ئینجا دەبێ پرسیارێکی لێ بکەیت کە نزیک بێت لە پرسیاری یەکەمەوە و پەیوەندی بەیەکەوە هەبێت، بەمجۆرە لەنێوان خۆت و منداڵەکەتدا دیالۆگێک دروست دەکەیت و دووركەویتەوە لەوەی کە زوو زوو قسە هەڵەکانی بۆ ڕاست بکەیتەوە، بەڵکو تۆ خۆت بەشێوەیەکی سروشتی قسەکان بەڕاستی بکەیت.

منداڵی چوار پێنج ساڵان حەز لە یاریکردن دەکات و زۆربەی کاتی خۆی بە یاری (پشکنین) دەباتە سەر و لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار حەز دەکات کە دانیشێ قسە لەگەڵ گەورەکاندا بکات، جا لەم کاتەدا زۆر گرنگە کە هەل وەرگریت و دەست بکەیت بە گێڕانەوەی حیکایەت و باسی شتێکی بۆ بکەیت. هەروەها یاری (زمانەوانی) زۆر بە کەڵکە بۆ منداڵ و کاتێکی خۆش پێکەوە دەبەنەسەر و ئەمانەش دەبێت بەهۆی هاندانی منداڵ بۆ بەشداریکردن لە پەیوەندی کۆمەڵایەتیدا و بەمەش زیاتر شت فێر دەبێت.

هەڵخەڵەتاندن

!بۆچی دەهێڵیت سۆران بچێت بۆ دەرەوە کەچی ناهێڵیت من بچم؟ دایکم دەهێڵێت یاری بکەم و تۆ ناهێڵیت، دایکم لەتۆ باشترە

کاتێ کە منداڵ ئەم قسانە دەکات و نەختێک ڕووی خۆی بە بەستەزمانی پیشان دەدات، ئەوا ئیتر پیلانی هەڵخەتاندنی خستۆتە کارو دەیەوێت وات لێبکات هەست بکەیت کە تۆ دادپەروەر نیت و لەسەر هەق نیت و دەتەوێت سزای بدەیت.

ئەم ڕەفتارە لای منداڵ زۆر ئاساییە، هەر لە ئێستاوە هەوڵدەدات تاقیت بکاتەوەو بزانێت چەند دەزانی و چۆن فێڵت لێدەکات و چۆن دەتوانێ بەسەرتا زاڵبێت. بە مانایەکی تر (تاقیکردنەوەی هێزی خۆی بەتۆ و دوایش بە کۆمەڵ پیشان دەدات.) ئەمە تێکۆشانێکی بێوچانە لە نێوانتاندا و تا تەمەنی گەنجیش هەر بەردەوام دەبێت. ئەم هەڵخەڵەتاندنە لەهەموو شتێکدا کە منداڵ دەیکات، خۆی دەنوێنێ، هەر لە نانخواردنەوە تا نووستن و چوونە دەرەوە و یاری و هەموو شتێکی تر. کاتێ کە منداڵەکەت دەڵێ من ئەم خواردنە ناخۆم، بەڵام فڵان خواردن دەخۆم، یاخود لە کاتی نووستندا کە منداڵەکەت دەیەوێت جارێکی تر بچێت بۆ ئاودەست، هەر لەبەرئەوەی کە تۆ تاقی بکاتەوە. دایک و باوک زۆرجار وا دەکەن کە کردەوەی منداڵەکە لە هەڵخەڵەتاندن تێپەڕێ و ببێت بە بێحەیایی و لاساری بەوەی چەند جارێک ڕێگای منداڵەکە دەدەن کە کارەکەی دوابخات، ئێستا نا ! ئیتر منداڵەکە وای لێدێ کە لاسار بێت، بەڵام ئەگەر بە ڕێژەیەکی گونجاو ڕێگا بدەیت بە منداڵەکەت کە بتخەڵەتێنی ئەوا خراپ نییەو ڕاهێنانێکە بۆ ژیان.

یاخود زۆرجار دایک و باوک ئەم هەڵخەڵەتاندنەیان پێخۆشە و واز لە منداڵەکە دەهێنن کە هەڵیان بخەڵەتێنێت و دەزانن کە ئەم خۆشیەیان لە دەست دەچێت کاتێ کە گەورە دەبێت.

کاتێ مرۆڤ بیر لەوجۆرە هەڵخەڵەتاندنە دەکاتەوەو دەبینێت کە خۆت هۆی ئەمەیت، بەوەی کە تۆش هەوڵدەدەیت منداڵەکە بخەڵەتێنێت(زۆرجار بۆ چاکەی خۆی) بەوەی کە بەرتیلی بدەیتێ، پەیمانی درۆی بدەیتێ یاخود هەڕەشەی لێ بکەیت، کە منداڵەکەش لە تۆوە فێری ئەوە دەبێت ئەم ڕێگایە بەکاردەهێنێت کە ئاسانترە کتێبە خۆشەویستیەکەی بگرێت بە دەستیەوە و بێتە بەردەمت بۆئەوەی بۆی بخوێنێتەوە وەک لەوەی کە هەر بڵێت وەرە کتێبم بۆ بخوێنەوە، کاتێ کە منداڵێکی بچووک لە ناوەڕاستی بازاڕدا دەزریکێنێ و هاوار

دەکات بۆ شتێک، کە باش دەزانێت ئاسانترە بۆی بۆئەوەی داواکەی بۆ جێبەجێ بکەیت وەک لەوەی لەماڵەوە داوای بکات، لەبیرمە کاتێک کە پێویستمان بە شتێک دەبوو ڕادەوەستاین تاکو باوکمان لەگەڵ کەسێکی تردا بووایە ئەوسا پێمان دەوت، ئیتر ئەو نەی دەوت نا و کارەکەی بۆ دەکردین، دەبێت لێرەدا ڕاوەستین و پرسیار لەخۆمان بکەین ئایا کاممان هەڵدەخەڵەتێنن. چۆن پیاو ڕووبەرووی ئەم ڕەفتارەی منداڵ دەبێتەوە و چاری دەکات، ئەمە دەکەوێتە سەربارو دۆخی ڕووداوەکە و تا چ ڕادەیەک دایک و باوک دەتوانن لەگەڵ منداڵەکەیاندا ڕەفتار بکەن.ئەگەر هەڵخەڵەتاندنی منداڵەکە نیشانەی زیرەکی و لاساریی منداڵەکەی تێدا بوو بۆچی مرۆڤ خۆی نەهاتە ناو یارییەکەوەو بزانێت لەکوێ سەر دەر دەهێنێت، توانای منداڵەکەت کە بتوانێت هەڵتبخەڵەتێنێ بەبێ ئەوەی تۆ بە خۆت بزانی نیشانەیەکی زیرەکی منداڵەکەیە و یارمەتیدەرێکی باشە لە دواڕۆژدا، لەگەڵ ئەوەدا بڕوام وایە کە مرۆڤ ناهێڵێ هەمووجارێک کە .منداڵەکە ئەوەی دەیەوێت بۆی بچێتە سەر، لەبەرئەوە منداڵەکە پلەی توانای خۆی بۆ دەردەکەوێت

بۆئەوەی یارمەتی منداڵەکەت بدەیت، کە یارمەتیدەر بێت، نەک هەوڵبدات هەمووکات هەڵخەڵەتێن بێت و ئەم کارە ببێت بە پیشەی :هەمیشەیی، کە ئەنجامەکانی زۆر باش نین، ئەوا ئەم خاڵانەی خوارەوە چەند پێشنیارێکن دەتوانرێت سوودیان لێوەربگیرێت

گفتوگۆ لەگەڵ منداڵەکەتدا بکە، پێش ئەوەی کە تەنگوچەڵەمە دروست ببێت، کاتێ کە دەزانێت ئەمیش داوای ئەوە دەکات کە براکەی -1 هەیەتی، دانیشە لەگەڵیدا و باسی تەواوی بۆ بکە کە بۆچی ئەو ئەوەی وەرگرتووە و بۆچی ئەم وەری ناگرێ و چەند پێشنیازێکی بخەرە .بەردەم کە خۆی بڕیار لەسەر یەکێکیان بدات

ڕێزی منداڵەکەت بگرە، گەر بتوانێت شتێک هەڵبژێرێ کە تۆ پێشنیازت کردووە، بەوەی کە پێشنیازەکە بگونجێ لەگەڵ تەمەن و -2 .هۆش و مێشکی منداڵەکەدا و بتوانێت لەبیری بێت کەچی هەڵبژاردووە

.بیرت نەچێ کە لەقەفرتێی منداڵەکە، ڕێیەکە بۆ تاقیکردنەوەی خۆی و زانینی سنووری هەڵسوکەوتی -3

بزانە کە تۆ خۆت چەند لە منداڵەکە دەبوورێت و چەند ڕێگاری دەدەی کە تووڕە بێت، لەوانەیە هەندێ لەو تووڕەبوونانەی تۆ -4 .پێویست نەبن و خۆت و منداڵەکەش لە شەڕوشوڕ ڕزگار بکەیت

بەشداری منداڵەکەت بکە لەوەی کە دەتەوێت ئەو بیکات، بەمە دەبێت بە نموونەیەکی زیندوو بۆ ئەو و هەستێکی خۆش دەدات بە -5 .هەردووکتان کە بەهۆی ئەوەوە دەتوانن زیاتر گفتوگۆ پێکەوە بکەن

کاتێک دەتەوێت منداڵەکەت شتێک بکات کە پێویستە، مەڵێ: (ئەرێ دەتوانی بچێت ئەو کارە بکەیت؟) بەڵکو بڵێ:(ئێستا بڕۆ و ئەم -6 کارە بکە!) بە مانایەکی تر داوا لە منداڵەکە نەکەیت کە ئایا دەیەوێت بیکات یان نا؟ و خۆی سەرپشک بێت لەوەی کە بیکات یان نا، .بەڵکو بە دەنگێکی لەسەرخۆ و بڕوایەکی تەواوەوە بڕیار بدە کە دەبێت ئەم کارە بکات و جێی گفتوگۆی تێدا مەهێڵەرەوە

پەسەندی کاری منداڵەکە بکە کاتێک کە یارمەتیدەرە و لەسەر بڕیارەکان دەڕوات، هەمووکات پێویست بە پێدانی بەبەرتیل ناکات، -7 .چونکە ئەنجامی باشی نییە

کاتێ ئێمە وەکو دایک و باوک ڕێگای هەڵخەڵەتاندن بەکاردەهێنین لەگەڵ منداڵەکەماندا، ئیتر بەمە بڕوای منداڵەکە بە جارێ دەڕووخێت .و توانای نامێنێ کە لە تەنگوچەڵەمەکانی ژیانی خۆی ڕزگاری ببێت

.گفتوگۆیەکی ڕاست و دڵسۆزانە باشترین ڕێگاچارەیە

بەمە منداڵەکە خۆی دەتوانێت پێشنیازێک لە نێوانی پێشنیازەکانی تۆدا هەڵبژێرێ و هەست بەوە بکات کە خۆی بڕیاری خۆی داوەو .لەئەنجامی کارەکەی ڕازییە

خۆپەرستیی منداڵ

:خۆپەرستیی منداڵ بەسێ شێوە خۆی دەنوێنێ

.یەکەم: منداڵ ناهێڵێ کەس یاری بە شتەکانی بکات

.دووەم: دەبێت هەمووکات چی ویست بیکات و هەمیشە گرنگی پێبدرێت

سێیەم: منداڵ گوێ ناداتە هەست و نەستی خەڵکی تر و بەلایەوە دنیایەکی تر نییە بێجگە لە دنیای خۆی.

ئەوەی ئێمە پێی دەڵێین خۆپەرستی شتێکی ئاسایی و چاوەڕوانکراوە لە ژیانی منداڵی (3 – 6) ساڵیدا و کاتێک کە تەمەنی لە تەمەنی چوونە قوتابخانە نزیک دەبێتەوە ئیتر منداڵەکە فێری ئەوە دەبێت لە ژیانی ڕۆژانەیدا بەشداری خەڵکی تر بکات و لەگەڵ قوتابیانی تردا بەشداری بکات و گرنگی پێدانی مامۆستا بەش بکەن بەیەکەوە. بۆ سێ چوار ساڵانێک کە تازە دەستی کردووە بە ناسینی کەسانێکی تر چ لە ماڵەوە و چ لە گەڕەکدا و چ لە باخچەی ساوایان. زۆر گرنگە کە بزانێ چۆن بەرەنگاری ئەم دنیا تازەیە دەبێتەوە و تا چ ڕادەیەک بۆی هەیە دەستدرێژی بۆ سەر سنوری خەڵکی تر بکات و سنووری خۆی چەندە، ئەمە تەنها بە تاقیکردنەوە فێردەبێت و تەنها ڕێگایەکە بۆ منداڵ کە فێری هەڵسوکەوت ببێت لەناو کۆمەڵدا و لەم ڕێیەدا زۆرجار منداڵ هەڵە دەکات و بۆی ڕاست دەکرێتەوە باشترین شوێن بۆ ئەوەی تاقیکردنەوەی خۆی تێدا بکات خێزانە کە بۆی هەیە هەڵە بکات بەبێ ئەوەی کەس لێی بڕەنجێ. هەر لەبەر ئەمەشە کە پێنج ساڵانەیەک دەست دەگرێت بەسەر یاری حەوت ساڵانەکەی برایدا و دەیەوێت داگیری بکات. دوو ساڵ لەوانەیە بەلای ئێمەوە کەم بێت بەڵام بۆ منداڵێکی پێنج ساڵان بازێکی گەورەیە و بەم هۆیەوە دەیەوێت وای پیشان بدات کە ئەمیش بە قەدەر برا حەوت ساڵەکەی گەورەیە.

ئەم بارودۆخە دەتوانرێت بۆ فێرکردنی منداڵە بچووکەکە بەکاربهێنرێت، کە ڕێی بدرێت کەسانی تریش یاری بە یارییەکانی بکەن، ئەمە زۆر بەهێواشی و لەسەرخۆ دەکرێت و کارێکی درێژ خایەنە، چونکە ئەم منداڵە لەخۆی دڵنیا نییە باشترین شت ئەوەیە کە هەر جارێک منداڵەکە ڕێگای دا منداڵێکی تر یاری بە شتەکانی بکات مەدحی بکەیت، بەمە منداڵەکە دەزانێت کە ئەم کارەی شتێکی پۆزەتیڤە، هەروەها هەڵسوکەوتی دایک و باوک لەم بارەیەوە زۆر گرنگە بۆئەوەی منداڵەکە چاویان لێ بکات.

هەروەها گفتوگۆکردن لەگەڵ منداڵە گەورەکەیاندا و تێگەیاندنی کە چەند برا بچووکەکەی خۆشی دەوێت و لەگەڵ ئەوەشدا حەسوودی پێدەبات، چونکە ئەم گەورەترە و زیرەکترە و زیاتر دەزانێت. زۆر باشە ئەگەر برا بچووکەکەی فێری شت بکات و بەمە یارمەتی برا گەورەکە بدەیت کە بەڕاستی لە بارودۆخی پێوەندییەکەیان بگات، کە ئەویش دەبێت بەهۆی بەهێزکردنی کەسایەتی و ڕێگا دەدات بەبرا بچووکەکەی کە یاری بە شتەکانی بکات و بەمەش دەبێت بە نموونەیەک بۆ برا بچووکەکەی. جاری وا هەیە چارەکردنی ئەم تەنگوچەڵەمەیە بەوە دەکرێت کە یەک دوو یاری بدرێت بە منداڵەکە خۆی و تەنها بۆ خۆی بێت و کەسی تر بۆی نەبێت یاری پێ بکات، بەڵام هەموو شتەکانی تر هی هەمووانە و دەتوانن هەموویان یاری پێ بکەن.

چەژنی لەدایکبوون کاتێکی باشە بۆ فێرکردن، کە تەنها ئەو هەڵبژێردراوە لەناو هەموو منداڵەکانی تردا لەو ڕۆژەدا بۆئەوەی دیاری بدرێتێ و لە جەژنی لەدایکبوونی منداڵێکی تردا منداڵێکی تر هەڵبژێردراوە و ئەم لەملاوە وەستاوە و جێگای تایبەتی نییە. ئەمە نموونەیەکی زیندووە بۆ منداڵ کە نابێت هەمووکات ئەم جێگای سەرەوەی هەبێت و هەموو ئەوانی تر لەدوای ئەمەوە بن، هەروەها هەبوون و مافی هەبوون کە گرنگییەکی تایبەتی هەیە لە ژیانی مرۆڤدا بۆ زانینی مافی خۆی و ڕێزگرتن لە مافی خەڵکی تر کە ئەوانیش مافی ئەوەیان هەیە کەشتی خۆیان هەبێت. لە تەمەنی(8 – 9) ساڵیدا ئیتر منداڵ فێری ئەوە دەبێت بزانێ شوێنی خۆی لەخێزاندا و لەناو هاوڕێکانیدا لە کوێیە و بەو پێیە هەڵسوکەوت بکات، خۆ ئەگەر منداڵێک لەم تەمەنەدا هەر بە خۆپەرست مایەوەو ویستی هەر خۆی بڕیار بدات لەهەموو شوێن و کاتێکدا، یان ئەوە بکات کە خۆی دەیەوێت، ئەوا ئەمە زیانێکی زۆر لە ژیانی منداڵەکە دەدات و لە دواڕۆژدا تووشی دڵشکان دەبێت و کار دەکاتە سەر پەیوەندی کۆمەڵایەتی منداڵەکە.

خۆ ئەگەر منداڵەکەت خۆپەرستیی نیشاندا چ لە ماڵەوە و چ لەگەڵ هاوڕێکانیدا، ئەوا پێویستی بە پشکنینی زۆر هەیە بۆ زانینی ئەو هۆیانەی کە بوون بە مایەی ئەم خۆپەرستییە، لەوانەیە یەکێک لە خێزانەکەدا بووبێت بەهۆی ئەمە، برایەک یان خوشکێک کە زیاتر گرنگی پێدەدرێ، یەکێک لە خێزانەکەدا کە نەخۆشییەکی هەیە کە پێویستی بە چاودێری زۆر هەیە. یاخود یەکێک کە زیرەک و وریایەو هەموو لایەک هەر باسی دەکەن. لێرەدا تەنها قسەکردنە کە سوودی هەیە لەگەڵ منداڵەکەدا و باسکردنی بارودۆخی خێزانەکە و شیکردنەوەی ئەو تەنگوچەڵەمانەی لەناو خێزاندا هەیە بۆ منداڵەکە و تێگەیاندنی کە هەرچی ڕوودات خێزانەکە ئەویان هەر خۆش دەوێت و ئەو خۆشەویستی هەمووانە و وای لێبکەن کە بەپێی توانای خۆی یارمەتی خێزانەکە بدات. لەم گفتوگۆیەدا بیر و هەست و نەست و گلەیی منداڵەکە دەردەکەوێت و ئەوساش ئاسانە کە بە هەمووتان هەوڵبدەن چاری بکەن.

زۆرجار ڕوو دەدات کە ئەم منداڵە تەنها لە ماڵەوە بەمجۆرە دەجووڵێتەوە، بەڵام لە دەرەوە و لە قوتابخانەدا بە جۆرێکی ترە و دەتوانێت ڕێزی مافی ئەوانی دەوروپشتی بگرێت و بە ئاسوودەیی لەگەڵیاندا بژی، بە مانایەکی تر ئەم خووە خوویەکی سەرەکی نییە و هەڵسوکەوتی منداڵەکە دەگەڕێتەوە بۆ بوونی تەنگوچەڵەمە لەناو خێزاندا و دەبێت چاری بکرێت و داوای لێ بکرێت کە دەبێت بەتوندی دوای یاسای خێزان بکەوێت، کە خێزانەکە بۆ خۆی داناوە، چ لە بارەی ئیشوکاری ناوماڵ بێت یان هەڵسوکەوتی ئەندامەکانی لەگەڵ یەک و ڕێگا نەدرێت بە منداڵەکە لێی لابدات.

## بەشی چوارەم

### منداڵ لە تەمەنی قوتابخانەدا (7 تا 12 ساڵان)

دوای ئەوەی منداڵ بەسەر ئەو قۆناغە دوو جەمسەرییەی پێشکەوتندا (خۆشەویستی و ڕق) سەرکەوت، لە زۆر تەنگوچەڵەمەی جۆراوجۆر ڕزگاری دەبێت و ئیتر دەبێت بە مرۆڤێکی پێگەیشتوو، کە دەزانێت چی ڕاستە و چی چەوتە. (ویژدان) ئێستا خۆی ئامادە دەکات بۆ قوتابخانە و لەماوەی ئەم پێنج شەش ساڵانەی داهاتوودا کە دەست دەکات بە پۆلی یەکەم و بە پلەی ناوەندی کۆتایی پێ دێنێت زۆر گۆران لەژیانیدا ڕوودەدات.

یەکەم ڕۆژی دەسپێکردنی قوتابخانە نیشانەی ژیانێکی تازەیە بۆ منداڵ و دایک و باوک هەستێکی سەیریان هەیە، کە بۆ یەکەمجار منداڵەکەیان دەدەنە دەست کەسێک یان کەسێکی تر، هەر لەم ڕۆژەوە منداڵەکە زیاتر ڕوو بەلای دەرەوەی خێزاندا وەردەگێڕێت و گرنگی بۆ دەرەوە زیاتر دەبێت، دەبێت بە زوویی ڕووبەڕووی ئەم دنیایە ببێتەوە کە زۆر زۆر فراوانترە و پێویست بە تێگەیشتوویی و ژیری زیاتر هەیە بۆئەوەی تێیدا سەرکەوێت، دایک و باوکی منداڵ تا چەند ساڵێکی زۆری تریش هەر پاڵپشتی هەست و بیری منداڵەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا ژیان و ڕۆڵیان لە ژیانی منداڵەکەدا زیاتر چڕوپڕ دەبێت.

لەناو خێزاندا منداڵەکەت خۆشەویستە و ڕێزی خۆی هەیە، لەبەرئەوەی کە منداڵی خۆتە، بەڵام هاوڕێیانی قوتابخانە ئەمە نازانن و گوێ بەوە نادەن منداڵەکەت برا گەورەیە یان برا بچووک، خوشکی گەورەیە یان کچە تاقانەی باوکییەتی. ئەم هاوڕێیانە گوێ بەوە نادەن منداڵەکەت حەزی لە چییە و چۆن بیر دەکاتەوە . ئەگەر شتێکی وا بکات کە جیاواز بێت لەوان ئەوا تووشی ناخۆشی دەبێت.

منداڵەکەت لە پۆلدا و لەناو قوتابخانەدا دەبێت فێری ئەوە بێت کە تووشی خەڵکی تازە و شوێنی تازە ببێت بەبێ یارمەتی تۆ، لە پاش ماوەیەک منداڵەکە فێری ئەوە دەبێت کە هەندێ کەس خۆشیان دەوێت و ئەمیان دەوێت وەکو هاوڕێ و هەندێ کەسی تر خۆشیان ناوێت و لێی دووردەکەونەوە، منداڵ دەبێت خۆی بڕیاری خۆی بدات لەم کاتەدا کە زۆرجار مانای ئەوەیە کە منداڵەکە هەندێ لەو بیروڕایانەی کە پێشتر بەرانبەر بە خۆی و خێزانەکەی هەیبووە بەسەریاندا بچێتەوە.

منداڵەکەت لەقوتابخانە تووشی سەرکەوتن و ژێر کەوتن دەبێت، ڕووی بە توانایی و بێتوانایی خۆی بۆ دەردەکەوێت و فێری کارکردن لەگەڵ منداڵانی تردا دەبێت، منداڵ تێدەگات کە خەڵک هەیە چاوەڕوانی شت دەکەن و هیوایان بەمە کە شتێک بکات و ئەمیش چاوەڕوانی شت لەخۆی دەکات، کە بیکات.

لەگەڵ دەستپێکردنی قوتابخانەدا منداڵ لە بارودۆخی جیاوازدا دەژی. ماڵەوە – پۆل – کۆمەڵ – هاوڕێ – کۆمەڵی وەرزش، لە شوێنێک سەرۆکە، لە شوێنێکی تر لە هەموویان خراپتر و لە شوێنێکی تر لە هەموویان خۆشەویسترە. لە شوێنێکی تر لە هەموویان زیرەکترەو هەروەها ..بەمە منداڵەکە زیاتر لەخۆی دەگات و لە گۆشەی جیاوازەوە سەیری خۆی و دەورووپشتی دەکات کە فراوانترە لە خێزانەکەی. لەگەڵ هاوڕێکانیدا لە قوتابخانە فێری شتی تازە دەبن کە پێویستە بۆ ژیان و گونجان لەناو کۆمەڵدا. کۆمەڵ زاڵ دەبێت بەسەر تاکە کەسدا و هەڵسوکەوتی منداڵەکە دەگۆڕێ.

لەم تەمەنەدا کوڕان خۆیان کۆمەڵی خۆیان هەیە و بەهەموو جۆرێک وا دەکەن کە لە کچان دووربکەنەوە و ئەم بەشکردنە لەوانەیە تا پۆلی سێ و چواریش بەردەوام بێت و لەم تەمەنەدا بە دگمەن کوڕێک دان بەوەدا دەنێت کە پێی خۆشە لەگەڵ کچێک قسە بکات و ئەمەش هۆی زۆرە. لەم تەمەنەدا کوڕ هەوڵدەدات خۆی لە دایکی ڕزگار بکات لەبەرئەوە خۆی دوور دەگرێ لەهەموو شتێک کە لە دایکی بچێت و دایکی بیکات. هەروەها لەم تەمەنەدا کوڕ خەریکی چەسپاندنی بناغەی پیاوەتی خۆیەتی و زۆرجار زیدەڕۆیی دەکات لەو ڕەفتارانەدا کە بە گرنگی دادەنێ، ئەمە لە هەڵبژاردنی (پاڵەوان)دا لەلایەن منداڵەکەوە دەردەکەوێت، پیاوە ئاسنینەکە، باتمان و سوپەرمان، یاخود سەرۆکی گەل و پیاوی گەورە (ئەمانە بەهێزن و هەرچەندە ژنیان لەگەڵدایە، بەڵام بە هیچ جۆرێک پێوەندییەکی بەهێزیان پێکەوە نییە).

لەلایەکی ترەوە دوورکەوتنەوەی کوڕ لە کچ دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە کوڕ تا ئێستا ئەو ترسەی ماوە کە بەمنداڵی پێیدا تێپەڕیوە و ترساوە لەوەی کە وەکو کچ ئەندامی زاوزێی لێ بسێنرێتەوە. لەبەرئەوە لە هەڵبژاردنی یاری و هیوایەتدا کوڕان فوتبۆڵێن و زۆرانبازی و مۆتورسیکل هەڵدەبژێرن و خواستیان ئەوەیە ببن بە پۆلیس و ئەستڕۆناوت و سوار بە یاریکەر و دکتۆر و ئەندازیار و کچان دەیانەوێت ببن بە مامۆستا و سستەر (پەرستار)و منداڵ بەخێوکەر و خەو بە خۆشەویستی و شووکردنەوەی دەبینن.

شت کۆکردنەوە

کوڕو کچ لەم تەمەنەدا شت کۆ دەکەنەوە، لە یەکەمجاردا منداڵ، بەشێوەیەکی هەڕەمەکی (خود بە خودی) و بەبێ ئەوەی بیەوێت شت کۆبکاتەوە و زۆر شتی جیاواز لەیەککاتدا کۆدەکاتەوە ، لە پارچە کاغەزێکی بچووکەوە تا بەروو و هەڵمات و وێنەو و زۆر جۆری تر، بەڵام وردە وردە ئەم کۆکردنەوەیە زیاتر ڕێکوپێک دەبێت و هەر منداڵەی شتێک دەکات بە هیوایەتی خۆی.

ئەم کۆکردنەوەیە پێویستییەکی دەروونی زۆر گەورە بۆ منداڵ پڕ دەکاتەوە و یارمەتی دەدات هەست بکات توانای هەیە ئەم جیهانەی دەوروبەری ڕێک بخات و بەهۆیەوە دەتوانێت ترسی خۆی کەمکاتەوە. ئەم ڕەفتارەی منداڵ لەلای ئێمە یارمەتی نادرێت و دایک و باوک کەمتەرخەمی دەکەن و بەلایانەوە منداڵێکی پاک و تەمیز باشترە لە منداڵێک کە گیرفانی پڕ بێت لە هەڵمات و پارچەدارو ئاسن، بەڵام ئەمە ڕاست نییە و باشترە کە منداڵ دەست و جلی خۆی پیس بکات و شت فێر ببێت وەک لەوەی کە پاک و تەمیز بێت و هیچ نەزانێ، بە زمانی سویدی دەڵێن: (منداڵی پیس و پۆخڵ تەندروستی باشە). منداڵ هەر لە تەمەنی سێ ساڵیەوە یاخود زووتریش ئەم کارە دەکات و هەوڵدەدات کە چیلکەدارو بەردو شت کۆبکاتەوەو لەگەڵ خۆی دەیباتەوە ماڵەوە، بەڵام لەوێ لێی دەسێنرێت و فڕێ دەدەدرێتە دەرەوە، لەبەرئەوەی ماڵەکە پیس دەکات، لە جیاتی ئەوەی یارمەتی منداڵەکە بدەن کە شوێنی تایبەتی بۆ داروبەردەکەی تەرخان بکەن لە کارتۆنێکدا یان لە شوێنێکی تردا کە منداڵەکە خۆی بتوانێ لەکاتی پێویستدا دەشتکاریان بکات و بەهیچ جۆرێک دەسکاری نەکەن تا لەگەڵ خۆیدا نەبێت و بەڕەزامەندی خۆی نەبێت. کاتێکیش کە ویستی فڕێی بدات ئەوسا خۆی بڕیار بدات.

تقوس و سیحر

منداڵ لەم تەمەنەدا زیاد لە پێویست حەزی لە تقوس و کردەوەی سەیرە و هەندێ قسە کە دووبارە دەبێتەوە بەبێ ئەوەی کەس تێیان بگات دەیکات وەکو قسەی چەتە و جادووگەر و شتی وا کە تەنها منداڵەکە و هاوڕێ تایبەتییەکانی تێی دەگەن و وا لە کەسانێکی تر دەکات کە نەتوانن بچنە ناو کۆمەڵەوە. دڵخۆشی ئەم منداڵە باس ناکرێ کاتێ کە بۆی دەردەکەوێ کە تەنها ئەم و ئەوانەی خۆی هەڵی بژاردوون لەم زمانە نهێنییە دەگەن و ئەمەش بۆ منداڵ گرنگە نموونەی ئەم وشانە:(گزە مزە لزە فزە کزە). ئەم تقوس و زمان و تەرتیلە بە ئاشکرا دەردەکەوێت کاتێ کە منداڵ یاری دەکات وەکو یاری (هەلور بەلور تەکامە) کە ئەم وشانە چەند جارێکی زۆر دەوترێتەوە بەبێ ئەوەی هیچی لێ بگۆڕێ و ئەوانەی کە هەڵە دەکەن نابێت لەناو یارییەکەدا بمێنێ، ئەو کەسەی هەڵە دەکات دەستووری یارییەکە تێکدەدات، جاری وا هەیە کە یارییەکە بەخۆی زۆر گرنگ نییە و دەستورەکانی زۆر گرنگترە و منداڵەکان ئاژاوەیان تێئەکەوێت لەسەر دەستوورەکە نەک یارییەکە.

ڕێکوپێک خستن و دەستبەسەراگرتن زۆر گرنگە لەم تەمەنەدا. منداڵان لەم تەمەنەدا گروپی تایبەتی دروست دەکەن کە دەستوورەکانی زۆر گرنگن، چەند منداڵێک کۆ دەبنەوە بۆئەوەی بڕیار بدەن کە چۆن و کەی کۆبوونەوەکەیان بکەن و کێ لەگەڵیان دەبێت و کێ بۆی نییە ببێت بە ئەندام و چی دەبێت بکەن و چۆن نهێنی کۆمەڵەکە دەپارێزن، ئەمە هەموو لەبەرئەوەی پیشانی بدەن کە ڕێکوپێک کردن زۆر پێویستە.

ژیانی قوتابخانە پڕە لە تقوس و سیحر، ئەمە بۆ ئەوەیە ئەو کەسانەی کە پەیوەندییان بەم گروپانە بکەن، کاتێ کە منداڵان لە ڕێگای قوتابخانەدا بڕیار دەدەن کە بە قەراخی شۆستەکەدا بڕۆن بە شێوەیەکی تایبەتی، هەموو ئۆتۆمبیلەکان بژمێرن، وشەیەکی تایبەتی لەژێر لێوەوە بڵێنەوە یان گۆرانییەکی تایبەتی بڵێن ئەمە هەمووی هەندێ لەو تقوسانەیە کە منداڵ لەنێوانی خۆیاندا لەسەری ڕێککەوتوون. لاسایی یەکێک بکەیتەوە لە ڕۆیشتنیدا لەسەر جادەکەو لە دوایەوە بڕۆیت، یاخود بە جۆرێکی تایبەتی دەستی یەکتری بگرن و بازبدەن و هەزارەها لەمجۆرە ڕەفتارانە بریتین لە ڕۆژگاری منداڵ.

لێرەدا سەرگوزشتەیەکی لەم بابەتم هاتەوە یاد کە منداڵانی گەڕەکی عەقاری لە شاری سلێمانی بەشداربوون تێیدا یاخود بوون بەهۆی ڕوودانی ئەم کارەساتە ناخۆشە، ئەویش ئەوەبوو کە چەند منداڵێکی گەڕەک دوای تەواوبوونی قوتابخانە لەبەردەرگا دادەنیشتن و قسەیان دەکرد، بڕیاریان دا هەموو ڕۆژێ کە خەڵکی لەوێوە دەڕوات ئەمان لەخۆیانەوە ژمارە بڵێن تاکو بزانن کێ تووڕە دەبێت، ئیتر دەستیان دەکرد بە وتنی ژمارە و هەر یەکەی ژمارەیەکی دەوت و ئەو کەسانەش کە لەوێوە تێدەپەڕین نەیان دەزانی ئەم منداڵانە بۆچی وا دەکەن و زۆر کەس وایان دەزانی کە گاڵتە بەوان دەکەن، تا مامۆستایەک ڕۆژێ لەڕۆژان چاری نەما و چوو بە گژیاندا و لەبەرئەوەی لە ژمارەی (73) دا ئەم مامۆستایە تووڕە بوو و هەرکە دەیانوت73ئیتر ئەو شێتگیر دەبوو و لەدوایدا بوو بەهۆی شێتبوون و وازهێنانی مامۆستاکە لە کارەکەی.

لەم ساڵانەی قوتابخانەدا جیهانی منداڵ لە جاران گەورەتر دەبێت، منداڵ دەچێت بۆ ماڵی هاوڕێکانی خۆی و گوێی لە دایک و باوکی ئەوانیش دەبێت و هەست دەکات بەو جیاوازییەی لە شێوەی قسەکردنی ئەوان و ماڵی خۆیاندا هەیە. لەوانەیە گوێی لە قسەی ناشرینیش ببێت و بۆی دەردەکەوێت گەورەی واش هەیە کە بێدەماغە و شتی خراپ دەکات. بۆی دەردەکەوێ کە مامۆستاش تووڕە دەبێت و درۆ دەکات و زۆرجاریش لەوانەیە دڵی زۆر ڕەقیش بێت و گوێا منداڵ ڕاکێشێ . بەکورتی بڵێین منداڵ بۆی دەردەکەوێ کە دایک و باوک و هەموو گەورەکانی تریش زۆر دوورن لەوەی کە ئەم بە تەواوی دەزانین. منداڵ فێری خوێندنەوە دەبێت و زیاتر شت فێر دەبێت و دەبینێت و دەبیستێت و بۆی دەردەکەوێت کە جیهان گەورەترە لەوەی کە ئەم دەیزانێ، زیاتر شێواوە و شوێنێکی ئاسوودە نییە کە تیا بژیت و گەلان شەڕ لەگەڵ یەکتری دەکەن و کارەساتی سروشتی ڕوودەدات، و خەڵکی لە وڵاتی خۆی ڕادەکات و خەڵکی بڕوا بەیەکتری ناکەن و دڵی یەکتری دەیەشێنن، لەبەرئەوە منداڵەکە تووشی دڵتەنگی دەبێت و ژیانی ئاسایی و بێگوناهی خۆی لێ تێکدەچێت و دەگۆڕێ بە ژیانی مرۆڤێکی گەورە کە زۆرجار ڕەق و ترسناک و ناخۆشە.

هەموو ئەو تقوس و سحرانەی کە باسمان کردن بریتین لە هەوڵدانی منداڵ بۆ خۆپاراستن لەم ناخۆشییانە و بۆئەوەی بتوانێ بەرەوپێش بڕوات و لەژیاندا پێشبکەوێت.

گرنگی ساڵانی قوتابخانەو تەنگو چەڵەمەکانی

لەم تەمەندا قوتابخانە دەبێتە بەشێکی گرنگ لە ژیانی منداڵدا و پێویستە قوتابخانە ئەو زانیاری و چاپوکییە بە منداڵ بدات کە یارمەتی دەدات تا ببێتە مرۆڤێکی سەربەخۆ. دەستکردن بە چوونە قوتابخانە زۆر ئاسان نییە بۆ منداڵ، منداڵەکەت ئیتر ئێستا بەشێکە لە کۆمەڵێک کە ئەندامەکانی یەکە یەکە و بە جیاواز کاریان لەگەڵ دەکرێت و پاداشت دەدرێنەوە، منداڵەکەت ون دەبێت لەناو گروپدا و لەناو ئەو هەموو یاساو شتی ڕۆژانەدا (ڕۆتین) کە کۆمەڵ بۆ خۆی داناوە و لەوانەیە کە نەزانێ چی بکات بەرانبەر بە مامۆستاکەی کە جیاوازە لە دایک و باوکی. بۆ یەکەمجار منداڵەکەت بە چاوی پشکنینەوە سەیری دەکرێت، لەلایەن یەکێک کە لەخێزانەکەی خۆی نییە و بەراورد دەکرێت لەگەڵ منداڵانی تردا. پلەی بەرزونزم دەدرێت و منداڵەکەت بەپێی ئەو شتانەی دەیانزانێت و دەیانکات، نەک لەبەرئەوەی کە ئەو ئەم کەسەیە.

لەقوتابخانە منداڵ فێری پێشبڕکێ دەبێت، دەزانێ چەند دەتوانێ و چەندی لە باردایە، فێری ئەوە دەبێت کە مامۆستاکەی چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکات کە هەندێ شت بزانێت و ئەویش داوا لە خۆی دەکات کە ئەو شتانە بزانێت و هەوڵی بۆ دەدات. منداڵ دەبێت چاری هەڵەو ڕاستی، هەق و ناهەق و ڕاستی و درۆ بکات و بۆی دەردەکەوێت کە هەمووکات ڕاستی سەرناکەوێت. زۆرجار جیاوازی نێوان دایک و باوک و مامۆستا زۆر نییە و مامۆستاش باوک یان دایکی منداڵێکی ترە لە قوتابخانەیەکی تر، بەڵام ئەوەی کە مامۆستا لە دایک و باوک جیادەکاتەوە ئەوەیە کە مامۆستا زیاتر بابەتییە لەبارەی هەڵسەنگاندنی زانیاری منداڵەکەوە، چونکە کەمتر لە چۆنیەتی ژیانی منداڵەکە دەکۆڵێتەوە. هەندێ دایک و باوک هەن بەڕاستی و ڕەوانی بە منداڵەکەیان ڕادەگەیەنن کە ڕازی بوون یا نەبوونیان لێی دەکەوێتە سەر ئەوەی کە چۆن لە قوتابخانەدا پێشدەکەوێت و زیرەکە، ئەگەر منداڵ هەستی بەوە کرد کە خۆشەویستی دایک و باوکی لەسەر زیرەکی و تەمبەڵی ئەم وەستاوە لە قوتابخانە، ئەوا ئەمە دەبێت بە تەنگوچەڵەمەیەکی گەورە بۆ هەست و نەستی منداڵەکە و تووشی گرفتی فێر نەبوون دەبێت.

منداڵ نەک تەنها لەلایەن مامۆستاوە، بەڵکو لەلایەن هاوڕێکانیشیەوە هەڵدەسەنگێنرێ و ئەم هەڵسەنگاندنەش جیاوازە لەهی مامۆستا هاوڕێیانی پۆل جیاوازن لە هاوڕێیانی کۆڵان، ئەم جیاوزییەش لە منداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر دەگۆڕێت، لە قوتابخانە منداڵەکان لەژێر چاودێری گەورەکاندان، بەڵام لە کۆڵان منداڵان هەر خۆیانن، ئەمە منداڵ فێری ئەوە دەکات لەیەککاتدا لەچەند کۆمەڵێکی جیاوازدا بژی و فێری دەستووری هەر یەکێک لەو کۆمەڵانە ببێت، منداڵێک کە بەرەوپێش بڕوات و پەروەردەی ڕاستی وەرگرتبێت لەهەموو ڕوویەکەوە بە ئاسانی دەتوانێت پارسەنگی ئەم کۆمەڵە جیاجیانە و دەستوورەکانیان ڕابگرێت کە زۆرجار لەگەڵ یەکدا ڕێک ناکەون.

زۆر منداڵ هەن ژیانی ڕۆژانەی قوتابخانەیان زۆر سەختە و بۆیان ناچێتە سەر، نەک لەبەرئەوەی کە توانایان نییە، بەڵکو لەبەر تەنگوچەڵەمەی دەروونی کە دیاری نادات تا ئەوکاتەی کە قوتابخانەو داواکارییەکانی نەیەنە ناو ژیانی منداڵەوە، منداڵێک کە پەیوەندییەکی توندی بە دایک و باوکییەوە هەیە و ناتوانێ لێیان جیابێتەوە، تووشی ناخۆشی دەبێت لە قوتابخانە. منداڵێک هەست دەکات کە لەماڵەوە گرنگی پێ نادرێت یا پشتگوێ خراوە و دەرناکەوێ لەناو منداڵانی پۆلەکەیدا، حەزدەکات زوو ڕۆژ تەواو بێت و بچێتەوە ماڵەوە کە لەوێ گوێی دراوەتێ و خۆشەویستی دایک و باوک وەرگرێتەوە. (ئەم تەنگوچەڵەمانە لە شوێنێکی تردا باس دەکەین).

بەشێوەیەکی گشتی کچان باشتر ئەم قوناغە دەبڕن، لەبەرئەوەی زووتر مێشکیان پێدەگات، توانایان زیاترەو زیاتر دەیانەوێت کە کاری قوتابخانە بکەن. زیاتر دەیانەوێت لە مامۆستا نزیک ببنەوە و بەقسەی بکەن و لە هەڵسوکەوتیاندا زیاتر هێمن و لەسەرخۆن، ئەمە بەشێوەی گشتی لە ساڵی یەکەمی قوتابخانەدا وایە، قوتابییەکی کوڕ دەیەوێت کە خۆی ڕزگار بکات لە دایکی لەم تەمەنەدا و هەرچی لە دایکی بچێت و دایکی بیربێنێتەوە ئەم لێی دووردەکەوێتەوە. کە زۆرجار مامۆستایانی سەرەتایی مامۆستای ژنن، جا ئەگەر مامۆستا ئەم ڕاستییەی زانی و هەوڵی دا کە پۆل بکات بە شوێنێکی خۆش بۆ منداڵ و ڕێگای دان کە زیاتر خۆیان خەریک بکەن بە کاری لەش و جووڵانەوە و کاری وا کە ئەو وزەیەی لەلەشیاندایە بەکاری بهێنن و دەری بڕن، ئەمە زیاتر منداڵەکە ئامادە دەکات بۆئەوەی ئەو زانیارییەی کە دەیدرێتی وەری بگرێت. خۆ ئەگەر مامۆستا هەوڵی دا بەهۆی زۆری قوتابییانەوە لە پۆلدا دار بەکاربهێنێ ئەوە لەلایەکەوە پۆلی کرد بە شوێنێکی ناخۆش بۆ منداڵ و ئەو وزەیەی کە لە منداڵدا هەیە و پێویستە بێتە دەرەوە بە شێوەیەکی تر دەری دەبڕێ (زۆرجار بە کاری خراپ) و مامۆستاش ناتوانێت بگاتە ئەو ئامانجەی کە هەیەتی.

## جیهانی منداڵ

جیهانی دەروونی منداڵ لەم تەمەنەدا لەهی گەورەکان زۆر جیاوازە. ڕاستە منداڵ لە خێزانەکەیدایە و دایک و باوکی گرنگی پێدەدەن وە ئاگایان لێیەتی و پێویستییەکانی بۆجێبەجێ دەکەن، بەڵام ژیانی ڕۆژانەی منداڵەکە و هەستی لە دەرەوەی خێزانەکەیەو لەگەڵ هاوڕێکانیدا دەژی، لە تەمەنی(8 - 9)ساڵیدا منداڵ دەبێت بە ئەندامێکی تەواوی گروپەکەی وە فێری سنوور و دەستووری ئەوان دەبێت و چاودێری دەکات لە هەڵسوکەوتیدا، کە زۆرجار وای لێدێ خێزانەکە دەترسن لەوەی منداڵەکەیان ئەمانی کەمتر خۆش بووێت و کەمتر گوێ دەدا بە خێزانەکەی و زیاتر لەگەڵ هاوڕێکانیدایە.

جیهانی هاوڕێیانی قوتابخانە یان کۆڵان جیهانێکی تایبەتییە، کار دەکاتە سەر منداڵ بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی ئەم منداڵە لە چ خێزانێک یان قوتابخانەیەکەوە هاتووە. هەست و بیری کۆمەڵ وا دەسەپێنێ بەسەر منداڵەکەدا و منداڵ وەری دەگرێ، ئەم ڕەفتارە لە منداڵەوە دەچێت بۆ منداڵ و منداڵە بچووکەکان چاو لە منداڵە گەورەکان دەکەن. بەمجۆرە دەستوور و یاسای گروپ بەردەوام دەبێت. ئەم کۆمەڵ و گۆڵمەز دروستکردنە هەندێ ئامانج دەهێننە دی، یەکەم ئەم گۆڵمەزە گۆڕەپانێکە بۆ منداڵ بۆئەوەی فێری ژیان بێت لەگەڵ خەڵکدا. گۆڵمەزەکە وەکو سەنگی مەحەک وایە بۆ کردەوەو ڕەفتاری منداڵ و خۆی خۆی دەبات بەڕێوە و دووەم دەبێت بەهۆی ئەوەی کە منداڵەکە هێمن و لەسەرخۆیی و ئاسوودەیی لە ژیانی خۆیدا بدۆزێتەوەو لەسەرخۆ بێت بەبێ ئەوەی کە باوک و دایک دەست بخەنە ژیانییەوە منداڵەکە بۆی دەرئەکەوێت کە پشتبەستن بە دایک و باوک زۆر باش نییە و هەوڵدەدات کە زیاتر پشت بە توانای خۆی و گروپەکەی ببەستێت، بە مانایەکی تر گۆڵمەزەکە بە دەوری گوێزەرەوە دەبینێت و یارمەتی منداڵەکە دەدات بۆئەوەی کە زیاتر سەربەخۆ بێت و منداڵان یارمەتی یەکتری دەدەن لەم کارەدا و دەستوورو یاسای تایبەتی بۆ یارمەتی یەکتر دادەنێن.

## گۆڵمەز چۆن ڕێکخراوە؟

گۆڵمەزی منداڵان لە قوتابخانە لەوانەیە گۆڵمەزێکی هەڕەمەکی بێت وەکو ئەو کۆمەڵە منداڵەی کە لە گۆڕەپانی قوتابخانەدا یاری دەکەن یاخود گۆڵمەزێکی ڕێکوپێکی داخراو بێت کە منداڵان لە تەمەنی 10 ساڵی و بەرەوژوور دروستی دەکەن، لەهەمانکاتدا ئەندامن لە زۆر گۆڵمەزدا بەبێ ئەوەی ئەمانە دژی یەکتری بن. بوون بە ئەندام لە گۆڵمەزدا شتێک دەدات بە منداڵ کە کەسایەتی خۆی هەیە کە(ئەمان) جیاوازن لە(ئەوان) ئەمان بۆیان هەیە وا بکەن و ئەوان بۆیان نییە بێنە ناو گۆڵمەزەکەی ئەمانەوە.

چۆنیەتی دروستبوونی گۆڵمەز پەیوەندی بە چۆنیەتی گەڕەک و پلەی زانیاری و ئابووری و سیاسی خەڵکەکەوە هەیە، پەیوەندی بە جۆری ژیان لە شاری گەورە و شاری بچووک و گونددا هەیە، ئەو منداڵانەی کە لە گەڕەکێکدا دەژین، دەچن بۆ یەک قوتابخانەو زیاتر گۆڵمەزەکەیان بەهێزترە لە گۆڵمەزێکی تر کە منداڵەکانی لە گەڕەکی جیاجیاوە دێن و دایک و باوکیان سەر بە کۆمەڵی جیاوازی لەیەکنەچوون لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە.

ئەو منداڵەی کە ئەندامە لە گۆڵمەزێکدا و دەتوانێت پێڕەوی دەستوور و یاسای گۆڵمەزەکە بکات و لە ئەندامانی گۆڵمەز بپرسێتەوە لەکاتێکدا کە پێڕەوی یاسای گۆڵمەز ناکەن، زۆرجار سەرۆکایەتی گۆڵمەز دەکات و لەوانەش نەک هەر لێرە بگرە لەزۆر گۆڵمەزی تریشدا هەر سەرۆکایەتی بکات، بەڵام هیچ دوور نییە هەمان منداڵ لە گۆڵمەزێکی تردا گرنگی پێ نەدرێت و وەریش نەگیرێ. بەڵام ئەم گۆڵمەزە چۆن لە ناوەوە ڕێکخراوە و چۆن کار دەکات. ئەوە کارێکی ئاسان نییە بچیتە ناوی و تێی بگەیت، کاتێ کە مامۆستا ئەوەندە سادەو بەستەزمان بێت و لە قوتابیانی پۆڵ بپرسێت کە کێ بوو ئەو کارە ناڕەواییەی کرد؟ ئەوا ئیتر بێدەنگی باڵ بەسەر قوتابییەکاندا دەکێشێ و پەردەیەک لەنێوان مامۆستا و قوتابییاندا دادەدرێتەوە، ئیتر کێ دەتوانێ دوو زمانی بکات؟ کێ دەتوانێ لە دەستووری گۆڵمەز خۆی جیابکاتەوەو ناوی گوناهبار بدات بە مامۆستا؟ گۆڵمەز جۆرێک لە ویژدان بۆ منداڵ دروست دەکات کە بۆئەوەی بە ئەندام وەربگیرێت، دەبێت بەرانبەر بە ناهەقی و زوڵمی کەسانی دەرەوە ڕاوەستێ و یارمەتی لێقەوماوان بدات، ئەو منداڵەی کە لە گۆڵمەزدا قبووڵ کرابێت ئەوە ئیتر ناترسێ کە یارمەتی منداڵی بچووکتر و لاوازتر بدات و ئەگەر دۆڕایش ئەوا بەسەربەرزییەوە دۆڕانەکە قبووڵ دەکات و خۆی بە دۆڕاوێکی خراپ نازانێت و دایک و باوکی ئاگادارناکاتەوە و نهێنی ناو گۆڵمەزەکە دەپارێزێ.

ڕاستی و پاکی بەرامبەر یەکتری زۆر گرنگە، بەڵام ڕاستی و پاکی بەرامبەر گەورەکان جیاوازە و ئەگەر شتێکی بچووکی لە دوکانێک خستە گیرفانییەوە ئەوە قەیناکات و زیانی نییە، زۆرجار کارێکی وا هەر بۆ تاقیکردنەوەی گەورەکان و بۆ زانینی سنووری خۆی ئەنجام دەدرێت، و لە ترسی ئەندامانی تری گۆڵمەز کە بە(ترسنۆک)ناوی نەبەن، ترسی منداڵ لەوەی کە لە گۆڵمەز دووربخرێتەوە زۆرجار پاڵی پێوە دەنێت شتی وا بکات کە هەرگیز خۆی بە تەنها نایکات.

لەناو گۆڵمەزدا منداڵ فێری ئەوە دەبێت کە دەستوور و یاسای کۆمەڵ بەگشتی فێر ببێت و ئەمە ببێت بە ماوەیەکی گواستنەوە بۆئەوەی بتوانێت هەڵسوکەوت لەناو کۆمەڵدا بکات و وەک هەر ئەندامێکی تری نێو کۆمەڵ بژی. بەڵام گۆڵمەز لەهەندێ کاتدا جێگای ناڕەحەتی دایک و باوکانە و جاری وا هەیە کە منداڵ زیاتر لەوەی کە سنوور ڕێگای پێداوە دەڕوات و کاری سامناک دەکات، کە نازانێت ئەنجامەکەی زۆر ترسناکترە لەوەی ئەو دەیزانێت و بۆ ئەوەی لە گۆڵمەزدا پەسەند بکرێت ئەوا ڕازییە بەهەموو ناوونانۆرەیەک و بەلایەوە گرنگ نییە کە ببێت بە گاڵتەچی گۆڵمەز و گۆڵمەزیش بەکاری بهێنێت بۆ تاقیکردنەوەی سنووری خۆی و بیکات بە قۆچی قوربانی، ئەویش بەم هۆیەوە بڕوای بە خۆی نامێنێ و دەبێت بە کەرەسەیەک بە دەست گۆڵمەزەوە.

کاتێک کە گۆڵمەزێک خەریکی گاڵتەکردن بوون بە یەکێک لەم جۆرە ئەندامانە و کڵاوەکەیان فڕێ دەدا لەنێوانی خۆیاندا و نەیان دەدایەوە، ئیتر ئەویش دەستی کرد بە گریان و ڕایکردە لای باوکی. باوکیشی لە ڕقا و لە داخی ئەوەی دەیزانی کە کوڕەکەی بووە بە گاڵتەچی منداڵان ئیتر ڕقی هەڵسا و ڕایکردە دەرەوە و لە منداڵەکان تووڕە بوو و زللەیەکیشی لە یەکێ لە منداڵەکان دا. بەڕاکردنی منداڵەکە بۆلای باوکی، یاسایەکی گرنگی لە یاساکانی گۆڵمەزەکە شکاند و بە هەڵەی تووڕەبوونی باوکی و دەست خستنە ناو کاروباری گۆڵمەزەکەوە ئیتر وای لێهات کە جارێکی تر کەس یاری لەگەڵ منداڵەکە نەکات و تا دەهات زیاتر تەنیا دەبوو، چونکە هەموو دەترسان لەوەی کە جارێکی تریش یاسای گۆڵمەز بشکێنێت. ئیتر باوکی منداڵەکە ناچار بوو بەوەی منداڵەکەی بۆ قوتابخانەیەکی تر بگوازێتەوە.

باشتر وایە ئەوە بزانێت کە یاسای گۆڵمەز بەهێزترە و خۆت دووربخەیتەوە لەوەی دەست بخەیتە ناو کاری گۆڵمەزەوە، هەروەها ئەوەش بزانیت کە یاسای ناوەوەی گۆڵمەز هەردەم لە گۆڕاندایەو ئەوەی ئیمڕۆ بڕیاری یاساکانی گۆڵمەز دەدات لەوانەیە سبەینێ لاچێ و یەکێکی تر ببێت بە بڕیاردەر، جا لەبەرئەوەی بە دەستخستنە ناو کاری گۆڵمەزەوە زیاتر تەنگوچەڵەمە بۆ منداڵەکەت زیاتر دەکەیت و لە کەسایەتی کەم دەکەیتەوە. باشتر وایە لە کاتی گیروگرفتی منداڵەکەتدا لەگەڵ ئەندامانی تری گۆڵمەزدا خۆی چاری ئەم گیروگرفتانە بکات و فێری شیکردنەوەی گرفتەکانی خۆی ببێت و بزانێت چۆن سەربەستی خۆی دەپارێزێ نەک تۆ ئەم کارەی بۆ بکەیت و ئەویش وەکو تەماشاکەرێک ڕاوەستێ بە دیارتەوە، لەکاتێکدا گرفت و کارەکە هی ئەون.

چاکەو خراپەی گۆلەمز

کاری خۆ رزگارکردن لە تەوقی دایک و باوک، زۆرجار دەست پێدەکات کاتێ منداڵ هەست دەکات بەوەی ئەم کەسێکی ترە لەوەی دایک و باوک دەیزانن، زۆرجار منداڵ دادەنیشێ و وا لەخۆی دەکات کە گوێی لەهیچ نییە، بەڵام لەڕاستیدا هەموو گیانی بووە بە گوێ و گوێی هەڵخستووە بۆئەوەی لەو قسانە بگات، کە گەورەکان دەیانکەن و ئەو لە دڵی خۆیدا پێکەنینی پێیان دێت و هەروەها پێکەنینی بە دایک و باوکی دێت کەوا دەزانن ئەم منداڵێکی بەستەزمانە و ئەو قسانەی ئەوان دەیکەن تێیان ناگات، ئەم هەستەی منداڵ کە هەستێکی شاراوەیە سەرەتای گۆڕانێکی تازەو پێویستە کە بە تەواوی لە تەمەنی باڵقیدا ڕوودەدات.

بۆئەوەی ئەم هەستە شاراوەیە لەگەڵ کەسانێکی تردا بەش بکات ئەوا منداڵەکە دەگەڕێ بەدوای ئەوانەدا کە هەمان هەستیان هەیە و لەگەڵیاندا گۆلەمزێک دروست دەکات.زۆرجار ئەم هەستە لە ساڵانی یەکەمی قوتابخانەدا خۆی بە شێوەی یاری دەردەبڕێت، وەکو یاری پۆلیس و دز، هندی و کاوبۆی و زۆر یاری تر کە جیاوازی هەیە لە تەمەنێکەوە بۆ تەمەنێکی تر و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر. زۆرجار تێگەیشتنی گەورەکان بەرامبەر گۆلەمز تێگەیشتنێکی ناتەواوە و بە شتێکی نێگەتیڤ ناودەبرێت لەناو کۆمەڵدا، کە لەڕاستیدا ئەمە وانییە و پێویست وایە چاوێکی پێدا بخشێنرێتەوە. هەر لەبەرئەوەی کە گۆلەمز زۆرجار کەلێنێک پڕ دەکاتەوە لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی و یارمەتی منداڵ دەدات کە هەست و نەستی خۆی بۆ گۆلەمزەکەی دەردەبڕێ بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت بەبێ چاودێری گەورەکان و زۆرجار ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە کە دروست دەبێت لەم تەمەنەدا زۆر بەهێزە و بەدرێژایی ژیان دەمێنێتەوە.

لەناو هەندێ گۆلەمزدا زۆر تاوان و خراپە دەکرێت و دەبێت بەهۆی خراپکردنی خوو و ڕەوشتی منداڵ، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ جۆری سەرۆکی کۆمەڵەکە و کۆنترۆلی بەسەر ئەندامانی گۆلەمزەکەدا.

لێرەدا پێویستی سەرشانی پەروەردەکاران ئەوەیە کە هەوڵبدەن لە گۆلەمز بگەن و لە جۆری ئەندامەکانی بکۆڵنەوە و دەستنیشانی ئەو کەموکورییانە بکەن، کە دەبێت بەهۆی سەپاندنی دەسەڵاتی کەسێکی زۆر بەسەر ئەندامانی گۆلەمزەکەدا. شک لەوە نییە کە زۆربەی ئەندامانی گۆلەمزی وا مرۆڤانێکن کە بڕوایان بە خۆیان لاوازە و بە ئاسانی دەتوانرێت کاریان تێبکرێت کە دوورکەونەوە لەم سەرۆکە زۆردارە.

لە ئەندامی خێزانەوە بۆ ئەندامی گۆلەمز

لەهەموو گۆلەمزێکدا(پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی ( SOCIAL STRUCTURE کە هەیە، بە مانای ئەوەی کە لە جۆرە کەسانێک پێکهاتووە کە دەگەڕێتەوە بۆ هەمان کۆمەڵ و هەر ئەندامەی ڕۆڵێکی جیاوازی هەیە لەناو گۆلەمزدا بەپێی پلەی کۆمەڵایەتی خۆی. ئەمجۆرە ڕێکخستنە لە پۆلێکی قوتابخانەدا دەبینین لە تەمەنی(7 – 12) ساڵیدا بە یارمەتی پشکنینێک کە لە ساڵی 1953 دا لەلایەن سوسیونۆم MERO و شوێلوند SJOLUND لە ساڵی 1968 دا کراوە دەتوانین ئەم ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییە لە پۆلێکدا یان لە گۆلەمزێکدا دەستنیشان بکەین بە کورتی جۆری پشکنینەکە وایە:

لەقوتابیانی پۆل دەپرسن: حەز دەکەیت لەگەڵ کێدا هاوڕێ بیت؟ (هەڵبژاردنی پۆزەتیڤ) و حەز ناکەیت لەگەڵ کێدا هاوڕێ نەبێت؟ (هەڵبژاردنی نێگەتیڤ). لە دوایدا نەخشەی وەڵامە نووسراوەکان لەسەر (نەخشەی پەیوەندی) دەکێشن لە نێوانی ئەندامانی پۆلدا. ئەم نەخشەیە پێی دەوترێت (SOCIOGRAM) و بەهۆی سۆسیۆگرامەوە بۆمان دەردەکەوێت کێ سەرۆکی پۆلەو چۆن حوکمداری ناو پۆل دەکرێت.

بەهۆی ئەو پشکنینەی کە لە قوتابخانەکاندا کردوویەتی بۆی دەرکەوتووە (STENSAASEN) دکتۆرێکی دەروونناسی نەرویجی بەناوی یاخود وای بەباش زانیوە کە ئەو جۆرە کەسانە کە لە پۆلدا سەرەکیین بەم بەشانەی خوارەوە دابەش بکات:

1- جۆری بەناوبانگ.

2- جۆری خۆشەویست.

3- جۆری پەسەندکراو.

4- جۆری ناحەز.

5- جۆری پشتگوێخراو.

1- جۆری بەناوبانگ.

ئەمجۆرە کەسانێک دەگرێتەوە، کە بە ئاسانی دەتوانرێت بناسرێنەوە لەناو پۆلدا، وەکو ئەو قوتابییەی هەموو کەسێک خۆشی دەوێت و حەزدەکات هاوڕێیەتی بکات، ئەمانە بەشێوەیەکی گشتی هەموو دەنگەکان وەردەگرن لە هەڵبژاردندا. ئێمە وەک پەروەردەکارێک پێویستە گرنگی بدەین بەمجۆرە قوتابیانە، چونکە ئەمانە بە ئۆتۆماتیکی سەرۆکی پۆلن و هەست و بیری ئەمانە زۆر بە نرخە لەلای گۆڵمەز و ئەوانی تر چاوی لێدەکەن و دەبێت ئێمە بگەڕێین بەدوای ئەو ڕەوشتە باشانەی لەم ئەندامانەدا هەیە و بۆ قوتابیانی ڕوون بکەینەوە بۆچی خۆشەویستن. ئەو شتە تایبەتییانەی کەوا لە منداڵێک دەکات کە بەناوبانگ بێت لەناو هاوڕێکانیدا جیاوازییەکی زۆری هەیە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر و لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی تر . جا بۆیە زۆر گرانە لێرەدا باسێکی تەواوی جۆری سەرۆکایەتی بکەین، بەڵام بەلای کەممەوە دەتوانین بڵێین دوو هۆی سەرەکی هەیە بۆ ئەمە:

( یەکەمیان ئەوەیە کە هەندێ منداڵ بەناوبانگ دەبن لەبەرئەوەی کە یارمەتیدەرن، دەتوانن دەوروپشتیان هانبدەن بۆ کاری باش و هەمووکات هەر لە جموجۆڵدان بۆ دروستکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی.

( دووەمیان):ئەوەیە منداڵەکە ڕووخۆشە و هاوڕێ پەرستەو ژیانێکی هاوئاهەنگی دەژی لەگەڵ دەروپشتیدا، بەمە هەست و نەست و پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی لە هاوڕێکانی زیاترە.

هەروەکو دکتۆر (STENSAASEN) لەگەڵ ئەمەشدا لەم تەمەنەدا 9 تا 12 ساڵی دوو جۆر سەرۆک هەیە جیای کردۆتەوە:

یەکەمیان : سەرۆکی ڕەسەن و ئەوی تریان سەرۆکی زۆردار.

سەرۆکی ڕەسەن ئەو سەرۆکە دیموکراسییەیە کە هەوڵدەدات ناکۆکی نێوانی ئەندامانی کۆمەڵەکە کەم کاتەوەو یەکیەتی نێوانیان بپارێزێ، ئەم سەرۆکە کۆمەڵ ڕێکوپێک دەکات و هانی دەدات بۆ چالاکی و گوێیان لێدەگرێت و بە قسەیان دەکات، هەروەها ئیش دەکات بۆئەوەی کە ئامانجی کۆمەڵەکە بێتەدی، ئەم سەرۆکە لەوانەی دەورووپشتی زیرەکترەو زیاتر بە کەڵکی ئەوە دێت کە سەرۆکایەتی بکات.

سەرۆکی دووەمیان سەرۆکی زۆردارە. ئەمە ئەو سەرۆکەیە کە بەزۆر خۆی سەپاندووە بەسەر گۆڵمەزدا بەهۆی هێزی بازوویەوە یان لەبەرگەورەیی و فێڵبازی و هەڕەشەوە زۆردارە کە هەندێ ئەندامانی کۆمەڵەکەی لەلاباشترە لەوانی تر و هەر کەسێک هەڕەشە لە شوێنی ئەو بکات ئەم دووری دەخاتەوە. زۆرجار ئەندامێکی کۆمەڵ دەکات بە گژ ئەوی تردا. ئەندامانی کۆمەڵ بەگژ یەک دەکات بۆئەوەی دەستیان بەسەردا بگرێت، ئەمجۆرە سەرۆکە دڵڕەقە و زیرەکە و تووڕەیە. هەرگیز گوێ لە هاوڕێکانی ناگرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ڕاددەیەک خۆشەویستە و خەڵکی لێی دەترسن، ئەمجۆرە سەرۆکە تەنها بۆ قازانجی خۆی ئیش دەکات، ئەمجۆرە سەرۆکانە لە زۆر ڕووەوە کامڵ نەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا هەمووکات لەهەموو کەس چاکترن لەچاوی خۆیاندا، ئەم بیرکردنەوەیە لەبارەی خۆیانەوە تەشەنە دەکات بۆ ئەوانەی دەورووپشتیان بەمجۆرە ئەم سەرۆکانە دەبن بەهۆی دروستکردنی زۆر تەنگوچەڵەمە بۆ خۆیان و بۆ کۆمەڵەکەیان.

2- جۆری خۆشەویست:

جیاوازی لە نێوانی جۆری یەکەم و جۆری دووەمدا زۆر نییە، بەڵام ئەو منداڵەی کە لەمجۆرە کەسانە بێت هەرگیز نابێت و نایەوێت ببێت بەسەرۆکی گۆڵمەز، زۆر ئەندامانی گۆڵمەزو پۆل دەیانەوێت و حەز دەکەن کە هاوڕێیەتی ئەمجۆرە کەسانە بکەن و زۆر دەنگیان بۆ دەدرێ لە هەڵبژاردنی پۆزەتیڤدا و هەموو ئەندامانی کۆمەڵەکە بەچاوێکی باش سەیریان دەکەن. ئەمانە زۆرجار ئەوەندە خۆ هەڵکێش نین و زۆر باسی خۆیان ناکەن. ئەمانە زۆر دڵنیان لە ژیانی خۆیان و لە هەڵسوکەوتیاندا.

3- جۆری پەسەندکراو:

ئەمانە ناوی خۆیان بەخۆیانەوەیە. هەندێ دەنگ وەردەگرن لە دەنگدانی پۆزەتیڤدا و هیچ دەنگیان بۆ نادرێ لە دەنگدانی نێگەتیڤدا. ئەمانە لەوانەن کە هاوڕێکانیان نە ڕقیان لێیان دەبێتەوە نە خۆشیان دەوێن، تەنها هەندێ لە ئەندامانی گۆڵمەز بیریان دەکەن کاتێ کە دیار نامێنن، بەڵام هەمووکات بە ئەندامی تەواوی کۆمەڵەکە دەژمێردرێن.

جۆری ناحەز -4:

ئەو قوتابیانەی لەمجۆرەن زۆرجار فشەکەرو خۆهەڵکێشن، لەبەرئەوەی زۆر لە ژیانی خۆیان دڵنیا نین، زۆر درۆ دەکەن بەبێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، بەشێوەیەکی گشتی بروایان پێ ناکرێت. هەمووکات هەوڵدەدەن خۆیان بەرزبکەنەوە لەسەر حسابی خەڵکی تر. بەلای خۆیەوە ئەم قەت هەڵە ناکات و زۆر کەم کەس حەزدەکەن کە هاوڕێیەتی ئەمجۆرە کەسانە بکەن و لە هەڵبژاردنی نێگەتیڤدا زۆر دەنگیان بۆ دەدرێت. ئەمانە بەشداری یاری کۆمەڵەکە دەکەن هەرچەندە دەنگی ناڕەزایی لەناو کۆمەڵەکەدا لە دژیان هەیە ئەگەر لە یارییەکدا نەبن کەس نییە بیریان بکات.

جۆری لەبیرکراو -5:

هەندێ قوتابی کوڕ و کچ لە پۆلدا لەمجۆرە کەسانەن و ئەمانە بەڕاستی لە بارێکی سامناک و ترسناکدان بەلای کەممەوە لەبارەی دەروونییەوە، کەس دەنگیان بۆ نادات. کەس نایەوێت هاوڕێیەتیان بکات. ئەمانە لە بارەی کۆمەڵایەتییەوە بە منداڵی تەنگوچەڵەمە لە قەڵەم دەدرێن. وەکو پەروەردەکار دەبێت بە تەواوی گرنگی بدەین بەمجۆرە قوتابیانە، جا بۆیە لێرەدا بەدرێژی باسی باری ئەم قوتابیانە دەکەین و دابەشیان دەکەین بۆ چوار بەش:

1- منداڵ کە پۆل نایبینێ.

2- منداڵ کە پۆل دەیەوێت دووریکەوێتەوە یاخود قبووڵ ناکرێت.

3- منداڵی پەناخراو.

4- منداڵی تەنها.

سێ جۆریان لەم منداڵانە بە تەواوی گرفتن بۆ خۆیان و بۆ ماڵ و قوتابخانە و کۆمەڵ.

1- منداڵ کە پۆل نایبینێ : ئەمانە خۆیان حەز دەکەن کە لەگەڵ گۆڵمەزدا بن و گۆڵمەزیش نەفرەتیان لێ ناکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قەت ناتوانن بێنە ناو گۆڵمەزەوە و ببن بە بەشێک لێی . قەت هەست بەوە ناکەن کە ئەندامن لە گۆڵمەزداو خۆیان بە تەماشاکار دەزانن، ئەمەش دەبێت بەهۆی ناخۆشی بۆیان و هەرکاتێکیش کە هەوڵدەدەن بۆئەوەی بچنە ناو گۆڵمەزی ترەوە کە لە تەمەنی خۆیاندایە هەر هەمان تەنگوچەڵەمەیان تووش دەبێت و وایان لێدێ کە خۆیان بە کەم بزانن، لەبەرئەوە هەوڵدەدەن بچنە ناو گۆڵمەزی منداڵی بچووکترەوە، ئەمجۆرە قوتابیانە پێویستیان بە یارمەتی هەیە چ لە قوتابخانە و چ لە ماڵەوە.

2- منداڵ کە پۆل دەیەوێت دووریکەوێتەوە یاخود قبووڵ ناکرێت: هەر لە جۆری منداڵانی یەکەمن، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر هەوڵدەدەن بچنە ناو گۆڵمەزەوە، بەڵام سەرناکەن، ئیتر دەبێت یان شەڕ بکەن و ببن بە منداڵی شەڕانی یاخود خۆیان بکەن بە گاڵتەچی پۆل و دەوری قەشمەر ببینن، چونکە دەیانەوێت بەم هۆیەوە سەرنجی قوتابیان و مامۆستایان بۆلای خۆیان ڕاکێشن. لەئەنجامی ئەم ڕەفتارەیانەوە وای لێدێ کە ئەوەندەی تر هاوڕێکانیان خۆیان لێ دوور دەخەنەوەو بەمە ئەم منداڵی دەکەوێتە ناو بارێکی خراپەوە کە تا بێت بەرەو خراپتر دەڕوات.

3- بەشی سێیەمی ئەمجۆرە منداڵانە قبووڵ دەکرێن لە گۆڵمەزدا بەڵام خۆیان حەز ناکەن و لە ڕاستیشدا ئەمجۆرە منداڵانە شەڕانی نین و پێویستیان بە گۆڵمەز نییە، خۆیان سەرپەرشتی کاری خۆیان دەکەن بەبێ ئەوەی ئەوانەی دەورووپشتیان دەست بخەنە کاریانەوە و ئەمانە زۆرجار مرۆڤی زیرەک و تێگەیشتوویان لێ دەردەچێت.

4- گەورەترین تەنگوچەڵەمە ئەوجۆرە لەبیرکراوانەن، کە خۆشیان نایانەوێت لەگەڵ گۆڵمەزدا پەیوەندیان هەبێت و خۆیان بە دوور دەگرن، ئەمانە بەهیچ جۆر هەوڵ نادەن، کە پەیوەندیان بە قوتابیانی هاوڕێیانەوە هەبێت، ئەمانە زۆرجار پێویستیان بە پزیشکی تایبەتی هەیە بۆئەوەی بهێنرێنەوە ناو کۆمەڵ.

ئەم هەموو جۆرە قوتابیانە لە دەورووبەری ئێمە هەن، کە زۆر لەمانە پێویستیان بە یارمەتی بەپەلە هەیە. بەڵام تاکو ئەم یارمەتییە دەست دەکەوێت و دەگاتە ئەم منداڵانە پێویستی سەرشانی پەروەردەکارانە کاتی خۆیان تەرخان بکەن بۆ خزمەتی ئەمجۆرە قوتابیانە.

:باشترین هاوڕێ یان هاوڕێی تایبەتی

لە دەوروبەری دەساڵیدا منداڵەکەت هاوڕێیەک هەڵدەبژێرێ لەنێوان هەموو ئەوانی تردا و دەیکات بە(باشترین هاوڕێ). زۆر دایک و باوک دڵگران دەبن و دەکەونە پرسیار لە خۆکردن لە بارەی ئەم هاوڕێ تایبەتیەوە و دەپرسن بۆچی زۆر بە یەکەوەن؟ بۆچی کەس نازانێ چی دەکەن؟ و خەریکی چین؟ منداڵی وا هەیە زیاتر لە هاوڕێیەکی خۆشەویستی هەیە و جاری وا هەیە کە هاوڕێی تایبەتی لە پڕێکا دەگۆڕێ و یەکێکی تر پەیدا دەکات. ئەم پەیوەندییە بەهێزە لەگەڵ هاوڕێی تایبەتیدا کارێکی گەورە دەکاتە سەر پێشکەوتنی منداڵ کە هەمان هیوایەتیان هەیە. هەمان نهێنیان هەیە. هەست و نەستیان لە یەکترەوە نزیکە، بەمە منداڵ هەست دەکات کە تەنها نییە لە هەست و نەستی دەروونیدا، بەهۆی هاوڕێیەکەیەوە فێر دەبێت کە چۆن تەنگوچەڵەمەکانی چارەسەر دەکات و فێری نزیکی دەبێت لە کەسێکی .ترەوە کە ئەندامی خێزانەکە نییە، بەڵام هەمان هەست و نەستی هەیە

بینینی منداڵ ئەگۆڕێ

لەم تەمەنەدا منداڵ لەگەڵ زۆر منداڵی تر و گروپدا هەڵسوکەوت دەکات، کە بە چاوێکی تر سەیری ژیان دەکەن و هەندێکیان لەگەڵ بیری ئەمدا ناگونجێ. منداڵ دەچێت بۆ ماڵی هاوڕێکانی و بۆی دەردەکەوێت کە ئەم خێزانە جیاوازن لە ئەمان و دایک و باوکی هاوڕێکانی و منداڵەکەیان بەجیاوازی ڕەفتار دەکەن. ئیتر منداڵ دەست دەکات بە بەراوردکردنی دایک و باوکی لەگەڵ دایک و باوکی هاوڕێکانی. زیاتر دایک و باوکی وەکو مرۆڤێکی ئاسایی دێتە بەرچاو نەک وەکو جاران کە ئەمان سەرچاوەی هەموو بیرو کردەوەو ڕاستی و دادپەروەری بوون لە دنیادا. چاوی منداڵ دەکرێتەوە و سەری سووڕ دەمێنێ لەوەی هەندێ گەورە هەڵەی گەورە دەکەن و درۆ دەکەن، بە ناهەق لەگەڵ خەڵکی شەڕ دەکەن و بڕیار دەدەن بەسەر خەڵکی دا کێ باشەو کێ خراپە، کآ گوناهبارە و کێ بێگوناهە؟

بینینی منداڵ بۆ دایک و باوک کەسێکن ڕۆڵی تایبەتیان هەیە لە ژیانی منداڵەکەدا دەگۆڕێ کاتێ منداڵەکە بۆی دەردەکەوێت، دایک و باوکی لەهەمووکاتێک و شوێنێکدا و لەلای هەموو کەسێک وانین وەک لای منداڵەکە جا تووشی بێهیوایی دەبێت و بۆی دەردەکەوێ، کە جیاوازن یاخود ئەوە نین کە ئەم دەیزانی، ئیتر دەست دەکات بە گەڕان بەدوای جیاوازی نێوانی خۆی و خەڵکی تر (ڕەنگ ، ئایین، خەڵکی کوێیە، نەتەوەکەی...)و منداڵ بیر لەمانە هەمووی دەکاتەوە و پرسیاریان لە بارەوە دەکات و زۆرجار وای لێدێ کە چاو بخشێنێتەوە بە خەیاڵاتی خۆیدا و بیان گۆڕێت. جا ئەگەر دایک و باوک بە دڵێکی فراوانەوە کاتێکی باش تەرخان بکەن بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی منداڵ و تێی بگەێنن، کە لە ژیاندا زۆرجار ناهەق سەردەکەوێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە ئێمەش ناهەقی بکەین و باسی ئەو هۆیانەی بۆ بکەین کە دەبێت بەهۆی جیاوازی نێوانی ئەم و خەڵکی تر، بەمە دەتوانین یارمەتی منداڵەکە بدەین کە لەم هەموو تەنگوچەڵەمە دەروونیانە ڕزگاری بێت و منداڵەکە زیاتر کاتی خۆی تەرخان کات بۆ چارەسەرکردنی ئەم ناهەقیانە لە .دواڕۆژدا

پاڵەوانی منداڵ

لەم تەمەنەدا منداڵ و گروپ و گۆڵەمز پێویستی بە پاڵەوانی تازەیە لەبەرئەوەی هەڵسەنگاندنی خێزان جیاوازە لەهی گۆڵەمز، منداڵ دەگەڕێت بەدوای پاڵەوانی خۆیدا لەناو فیلم و حکایەت و کەسانی وەرزشکارو پیاوانی سیاسی و سەرۆکی گەل و پیاوانی مێژوویدا و هەوڵدەدات وەکو ئەوان بکات، وەکو ئەوان نان بخوات و باس هەر باسی پاڵەوانەکەیەتی، سەبارەت بە کچان زیاتر مامۆستا یاخود خوشکی هاوڕێکەی یان گۆرانیبێژێک یان ئەکتەرێکی سینەماو شانۆ دەبێت بە پاڵەوانەکەی. ئەم پاڵەوانە زوو زوو دەگۆڕێت بە پاڵەوانێکی تر، ئیمڕۆ بەلای منداڵەوە فوتبۆل گرنگە ئیتر خۆی خەریک دەکات بە پاڵەوانی فوتبۆڵینەوە و سبەینێ فڕۆکەوانی و .بەمجۆرە پاڵەوانەکانی دەگۆڕێت

ئەم قۆناغە قۆناغی بەرەو پێشکەوتنە. قۆناغی وەرگرتنی زانیاری و فێربوونێتی، قۆناغی گەورەبوونە. کاتێ کە منداڵەکەت تەندروستی باش بێت و بەشداری لەشی و دەروونی و هەستی چالاکییەکانی قوتابخانەکەی بکات و لەگەڵ هاوڕێکانیدا بتوانێت هەڵسێ و دانیشێ و لە کۆڵان و گەڕەکدا بتوانێ لەگەڵ هاوڕێیانی کۆڵاندا هەڵسوکەوت بکات و هەوڵبدات شتی تازە فێر ببێت و نەترسێ لە کاری قورستر .لەتوانای خۆی ئەوا پێگەیشتنی منداڵ بە ئاسایی دەڕوات و پێویست بە ترس ناکات لە دواڕۆژی منداڵەکەت

:(هەست و نەستی منداڵ (بیر

لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا هەست و نەستی منداڵ بەزۆر شێوە پێشدەکەوێت. لە بیرمانە منداڵی باخچەی ساوایان تێ نەدەگەیشت کە قەبارەی ئەو ئاوەی لە پەرداغە بەرزە شێوە لوولەکیەکەدایە هەروەکو قەبارەی هەمان ئاوە، کە لەپەرداغە پانەکە دایە، بەڵام قوتابییەک ئێستا ئەوە دەزانێت و دەزانێ گۆڕانی وێنەی پەرداغەکە لە قەبارەی ئاوەکە ناگۆڕێ و ئەوی لەدرێژی کەم دەبێتەوە دەچێتە سەرپانی. قوتابی لەم تەمەنەدا دەتوانێت تەنگوچەڵەمەی گران و ئاڵۆز چارەسەر بکات و دەزانێت ئەگەر سیروان درێژتر بوو لە ئازاد و ئازاد درێژتر بوو لە بەهزاد، ئەوا سیروان درێژترە لە بەهزاد.

سیروان درێژترە لە ئازاد

ئازاد درێژترە لە بەهزاد

سیروان درێژترە لە بەهزاد

ئەمە مانای ئەوەیە منداڵەکە دەتوانێ پەیوەندییەکی هاوبەش و تازە بدۆزێتەوە لە نێوانی ڕووداوەکاندا و دەتوانێ ئەوە بزانێت، کە بەهۆی چەند ڕووداوێکەوە کە زووتر ڕوویان داوە ئێستا ڕووداوی تر لەوانەیە ڕووبدەن، ئەمە پێشکەوتنێکی زۆر گرنگە لە پێشکەوتنی بیر و لۆژیکی منداڵەکەدا. منداڵ لەم تەمەنەدا فێری ئەوە بووە کە شت ڕیز بکات و بیخاتە خانەی جیاوازەوە، بەرد ، پارە ، پوول، پاڵەوانی سینەما، سەرەسۆدە، کردەوەی چاک و خراپ، پیاوی باش و خراپ، ئەمە گرنگیەکی گەورەی لە ژیانی منداڵدا هەیە و فێری ئەوەی دەکات کە بەئاسانی جیاوازی بکات لە نێوانی خەڵک و شوێن و کات و شتومەکدا. هەر لەبەرئەوەی فێری ڕێکخستنی شتومەک بووە لە خانەی جیاواز و جیاجیادا، ئیتر بۆی دەردەکەوێت کە هەر یەکێ لەمانەش دەتوانێت دابەش بکات بە جۆری بچووکترو جیاوازترەوە کە منداڵ نەخۆش کەوت مانای ئەوە نییە ئیتر ئەم دەبێت لێی بترسێ، کە منداڵەکە خەریکە بمرێ و لەوانەیە قەت چاک نەبێتەوە ئێستا فێری ئەوە بووە، کە نەخۆشی جۆری جیاوازی هەیەو جیاوازی لەنێوانی نەخۆشیی کوشندە و نەخۆشی تردا هەیە. گۆڕانێکی گەورەی تر کە ڕوودەدات لە مێشکی ئەم منداڵەدا دیتنی منداڵەکە دەگۆڕێ بەرانبەر بە سحرو جادوو لەتەمەنی پێش قوتابخانەدا منداڵ هیچ سەری سوور نامێنێت لەو جادووگەرەی کە ڕاوەستاوە و یەک هێلکە لە دەمیەوە دەردەهێنێ. بەڵام قوتابیانی سەرەتایی بە جارێ سەریان سووردەمێنێ و دەست دەکەن بەپرسیارکردن و بەهەمووجۆرێک دەیانەوێت تێبگەن کە چۆن ئەم جادووگەرە ئەمە دەکات.

لەم تەمەنەدا منداڵ کەمتر خۆپەرستە و زیاتر گرنگی دەدات بە دەورووپشتی و دەتوانێت لە گۆشەی جیاوازەوە سەیری مەسەلەکان بکات و بزانێ کە خەڵکی چۆن هەست بە شت دەکەن و لەم تەمەنەدا زانیاری منداڵ زیاد دەکات لەبارەی لەشی خۆیەوە و دەزانێ کە دڵ هەمیشە لێدەدات لەبارەی جیهان و ئاسمان و دەریاکانەوە، ئیتر منداڵ دەزانێت کە تەمەنی باوکی هەموو کات لە تەمەنی ئەم چەند ساڵێک زیاترەو ناگۆڕێ بە گەورەبوونی هەردووکیان. هەرچەندە منداڵ ئەم هەموو پێشکەوتنانەی بەسەردا هاتووە دەتوانێ ڕستەی گەلێ گرانیش بخوێنێتەوە و بەراوردی شتومەک بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار لێکدانەوەی لۆژیکی نییەو ناتوانێ تەقدیری ڕاستی شت و جێگا و خەڵکی بکات و خەیاڵ بەکار دەهێنێ لە بیرەکانیدا. بەڵام ئەوەی زیاتر ئەم قۆناغە دیاری دەکات و دەتوانین وەکو دایک و باوک و مامۆستاو پەروەردەکار یارمەتی منداڵ بدەین، ئەوەیە کە منداڵ تینووی زانیارییە و بەهەموو لایەکدا هەوڵدەدات زیاتری دەست کەوێت و لێرەوە بناغەی مرۆڤێکی تێگەیشتووی بەرەوپێش و سەربەخۆ و دیموکراسیخواز دادەنرێ.

ویژدانی منداڵ پێدەگات

لەنێوانی(6 – 9)ساڵیدا منداڵ دوای ئەو دەستوور و یاسایانە دەکەوێتە کە بۆخۆی داناوەو لادان لێیان بەشتێکی زەحمەت دەزانێت. منداڵ لەم تەمەنەدا یاری و دەستوورەکانی یاری وەکو یەک بە گرنگ دەزانێت و دەستوور دەستوورە و دەبێت دوای بکەوێت.

هەروەها منداڵ جیاوازی ناکات لە نێوانی درۆیەک بۆئەوەی شتێکی پێ دەست بکەوێت یان درۆیەک بۆئەوەی هەستی کەسێک بپارێزێ و بریندار نەبێت، درۆ درۆیە و بەس، لەبەرئەوە ئەگەر منداڵێک بە ڕێکەوت بەردێکی هاویشت و پەنجەرەیەکی دراوسێکەیانی شکاند ئەوا لەلای ئەم، ئەم منداڵە هەروەکو ئەو منداڵە گوناهبارە کە بەردەکە بەڕاستی دەهاوژێت و پەنجەرەکە دەشکێنێ. پێشکەوتن و گۆڕانی ویژدان لەم تەمەنەدا دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە منداڵ ئێستا خەڵکی جیاواز دەبینێ و لەگەڵیان هەڵسوکەوت دەکات، فێر دەبێت کە خەڵکی ڕوانینی جیاوازیان لە بارەی ڕاست و درۆوە هەیە و ناچار دەبێت دان بنێ بەوەدا کە بینینی دایک و باوکی زۆرجار جیاوازە و گوڵەمەز وای لێدەکات ئەمیش بینینی بگۆڕێت و چاودێری بارودۆخی ڕووداوەکە بکات و هەریەکەی بەجۆرێکی تایبەتی و بەشێوەی جیاواز هەڵسەنگێنێ. هەروەها منداڵ فێر دەبێت بە چاوێکی جیاواز سەیری گوناه و سزا بکات و وا چاوەڕوان دەکات کە ئەگەر گوناهی گەورەی کرد ئەوا سزایەکی گەورەی دەدرێ، لەناو گوڵەمەزدا فێری ئەوە دەبن کە چاوپۆشی لە کەموکوڕی یەکتر بکەن.

## دزی

زۆر هۆ هەن بۆئەوەی منداڵێک دزی بکات و زۆر جۆری جیاواز لە دزی هەیە. جاری وا هەیە منداڵێک پارەیەکی کەم لە گیرفانی باوکی یان دایکی دەردەهێنێت یاخود شتێکی بچووک لە هاوڕێکەی یان دوکانێک دەخاتە گیرفانیەوە، دەبینین منداڵەکە پێویستی بەم شتەش نییە و بەکاریشی ناهێنێت. لەوە دەچێت خواستێکی تری بەم دزییە بەجێ بهێنێ.

زۆر منداڵ کە ئەم کارە بەم شێوەیە دەکات، هاوارێکی ئاشکرایە بۆئەوەی یارمەتی بدەن و گوێی بدەنێ. داوای خۆشەویستی دەکات، دزییەکە دەکات بە بیانوویەک بۆئەوەی کە دایک و باوکی زیاتر گرنگی پێبدەن. کاتێ بۆت دەرکەوت منداڵەکەت دزی کردووە باشتر وایە پێی بڵێیت و داوای لێ بکەیت بۆت روون بکاتەوە ڕاستی ڕووداوەکە چۆن بووە، هیچ سوودی نییە کە دانیشیو باسی ویژدان و ڕاست و چەوتی بۆ بکەیت و پێویستیش ناکات لە نرخی منداڵەکە کەم بکەیتەوە. تۆ دەتەوێت منداڵەکەت بزانێت کارەکەی ڕاست نییەو ویژدان ڕێگا نادات بە دزیکردن نەک ئەو مرۆڤێکی خراپە. ئەوەی کە پێویستی بە قسەکردن هەیە منداڵەکەیە نەک تۆ.. منداڵەکەیە کە پێویستی باسی باری چەوتی خۆی بکات و بڵێت بۆچی دزییەکەی کردووە و هۆی چی بووە. بۆئەوەی تۆ بۆت ڕوونبێتەوە کە هەڵەکە لە چیدایە،(باشتر وایە کە تۆ گوێ بگریت نەک ئەو) دوای ئەوە داوای لێبکەیت کە شتەکە بەرێتەوەو دوورکەوێتەوە لەوەی کە ئەم کارە(دانەوەی شتەکە بە خاوەنەکەی) بکەیت بە چەکێک بە دەستتەوە بۆ شکاندنی منداڵەکە، لەگەڵیدا بچیت بۆ شوێنەکە و داوا لە خاوەنەکەی بکەیت منداڵەکەت شتێکی هەڵگرتووە بەبێ ئەوەی پارە بدات. ئەمە زۆر گرنگە کە شتە دزراوەکە بە تەواوی بدرێتەوە بە خاوەنەکەی . بزانی هۆی دزییەکە چییە کە لەوانەیە منداڵەکە ئەمە دەکات لەبەرئەوەی دڵی هاوڕێکانی ڕازی بکات یان یەکێکی خۆشەویست پشتگوێی نەخات یان تەنگوچەڵەمەی هەیە لەگەڵ مامۆستاو هاوڕێکانیدا. ئەو منداڵەی کە دزی دەکات بەهۆی برسێتی و نەبوونیەوە، ئەمەیان تەنگوچەڵەمەی هەموو کۆمەڵە و دەبێت بەهەمووان هەوڵبدەن بۆ یارمەتی دانی ئەم منداڵە.

## گفتوگۆکردن

کاتێ باسی هەست و نەستی منداڵ و بیرکردنەوەیمان کرد باسی ئەوەمان کرد کە ئەمە دەبێت بەهۆی توانای منداڵ بۆ قسەکردن. قسەکردن ئێستا لەگەڵ منداڵێکی(7 – 9) ساڵیدا دەبێت بە گفتوگۆ.

لەوەو پێش منداڵ لە قسەکردن تەنها قسەکانی خۆی دەکرد و گوێی لە قسەی تۆ زۆر نەدەگرت و قسەکردنەکە لە ڕاستیدا بریتییە لە هەزارەها پرسیار کە هەندێکیان زۆر بە زەحمەت وەڵامیان دەدرێتەوە.

لە تەمەنی منداڵی ساوادا (پێش سێ ساڵی) منداڵ زمانی بۆ دروست دەبێت بەپێی قسەکردنی گەورەکان لەگەڵیدا بەبێ ئەوەی خۆی بەشداری بکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوێی لێدەگرێ و بەجۆرێک خۆشی دەبەخشێت بە منداڵەکە. لە کۆمەڵی کوردەواریدا بەهۆی زۆری ئەندامانی خێزانەوە ئەم کارە بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکرێت دەکرێت، گەورەکان هەمووکات لەدەوری منداڵەکە قسەدەکەن. بەڵام چەندی ئەو قسانە لەگەڵ منداڵەکەدا دەکرێن ئەوە شتێکی ترەو خێزان دەتوانێت بە ئاسانی جیاوازی لەنێوانی قسەی خۆیان و قسە لەگەڵ منداڵ کردندا بکات. قسەکردن لەگەڵ منداڵ هەر لەم تەمەنەدا کارێکی یەکجار دەکاتە سەر ژیانی کۆمەڵایەتی و مێشک و دەروونی منداڵەکە. جا بۆیە دەبێت ئەم کارە ڕەچاو بکرێت بەتایبەتی لەخێزانی تازە دروستبوودا کە تەنها دایک و باوکەکە لەدەوری منداڵەکەن یاخود جاری وا هەیە بە تەنها دایکەکە ڕۆژانە لەلای منداڵەکە دەمێنێتەوە.

لێرەدا نموونەی ئەو پیاوەم دێتەوە بەرچاو کە بە بازارە گەورەکەدا دەڕۆیشت و منداڵەکەی بە باوەشیەوە هەڵواسیبوو، لەگەڵ منداڵەکەی قسەی دەکرد و دەیوت ئێستا دەچین شیرەکە دەهێنین، شیرەکە لەو سەرەوەیە لەناو شوێنێکی ساردا، پێویستمان بە نانەو دەبێت ئارد بکڕین، ئیتر ئەو پیاوە هەر بە دوای شتەکاندا دەگەڕا و قسەی لەگەڵ منداڵەکەی دەکرد و لە هەمووی خۆشتر ئەوەبوو، کە منداڵەکە وا جوان و لەسەرخۆ خۆی مەڵاس دابوو بە سنگی باوکیەوە کە ڕەزامەندی لە چاوەکانیدا دەدرەوشایەوە وەکو بە خەڵکی بڵێت سەیرکەن من چەند جێگاکەم خۆشە و چەند قسە لەگەڵ باوکما دەکەم. ئاوا ئەم باوکە لەگەڵ منداڵەکەی خۆیدا دەدوا و پەیوەندییەکی نزیکی بەهۆی وشەکانیەوە دروست دەکرد.

وتمان منداڵ لەم تەمەنەدا (7 – 12) ساڵی زیاتر هەوڵدەدات ڕووداوەکان لە سووچی تریشەوە ببینێت و فێری ئەوە دەبێت کە بزانێت زیاد لە ڕێگایەک هەیە بۆ باسکردنی ڕووداوەکان. ئەمە وا دەکات کە ئەم قسەکردنە لەگەڵ خەڵکی تردا بگۆڕێت بە گفتوگۆ، لەبەرئەوە دەبینین کە منداڵانی پۆلی یەکەم و دووەم هەریەکە بە جارێ باسی خۆی دەکات و کاتێ لانە دەڵێت:(سەیرکە چەند ڕەنگێکی جوانم بەرکەوت) لەولاوە جوانە دەڵێت: (ڕەنگەکەی من تەواو بوو) ئەم منداڵانە قسە بەسەر قسەی یەکتردا دێنن و نەگەیشتوونەتە پلەی گفتوگۆ.

ئەمە زۆر ناخایەنێ کە لە پۆلی سێ و چواردا ئیتر منداڵ فێر دەبێت گوێ بگرێت و سوود لە بیروڕای ئەوانی تر وەربگرێت و دەیەوێت لە هەڵسوکەوتی پۆلدا بەشداری بکات. سەیرو سەمەرە: لەم تەمەنەدا کە منداڵ فێری ئەوەبوو کە بیر بکاتەوە، وەڵامی وا هەڵدەبژێرێ بۆ پرسیارەکان کە بەڕاستی دەزانێ و هەر لەبەرئەوەی لەسەرەتای ئەم ڕاهێنانە دایە دەترسێ وەڵامەکەی بیربچێتەوە و هاوار دەکات کە مامۆستا گوێی لێبگرێت جا مامۆستا هاوار دەکات بەسەریدا کە بێدەنگ بێت و ئیتر نابێ کەس قسە بکات. جارێک دوو و سێ و چوار، ئیتر منداڵەکە بۆخۆی بێدەنگ دەبێت و جارێکی تر نایەوێت وەڵامی پرسیارەکانیش بداتەوە، هەرچەندە دەشزانێ بۆئەوەی جارێکی تریش مامۆستا هاوار نەکات بەسەریدا. لەکاتێکی وادا کە زۆربەی منداڵەکان هاوار دەکەن وەڵامی پرسیارەکە بدەنەوە و مامۆستا ناتوانێ بەهەموویان بڵێت وەڵام بدەنەوە. باشتر وایە کە منداڵەکان دوو دوو یان سآ سآ گروپ دروست بکەن و وەڵامی پرسیارەکە بەیەک بڵێن و بەمجۆرە لەگەڵ یەکتریدا بکەونە ئاخاوتن. هیچ زیانێکی نییە کە پۆلەکە بۆ ماوەی پێنج دەقیقەیەک ببێت بەحەمامی ژنان و منداڵان ئەوەی لە دڵیاندایە دەری بڕن. چونکە پۆلی وا پۆلێکی بە هەڵسوکەوتە و باشترە لە پۆلێکی بێدەنگ و ئاقڵ. جا لێرەدا پێویستمان بە گفتوگۆیەک هەیە لەناو خۆماندا وەکو پەروەردەکاری منداڵ. (ئایا منداڵ قسە بکات لە پۆلدا باشترە یان ئاقڵانە دانیشێ و سەری مامۆستا نەیەشێنێ؟) ئایا قوتابخانە خۆی چییەو ئەمانەوێ چ قوتابیەک و مرۆڤێک بۆ کۆمەڵ بەرهەم بهێنین؟ کەسێکی گوێڕایەڵی بێدەنگ، گلەیی نەکەری ترسنۆک کە خۆی نەزانێ چی دەوێت و هەرچی گەورەکان پێی بڵێن بیکات باشترە یان مرۆڤێکی سەربەست و سالار کە بە چاوی ڕەخنەوە سەیری پێشنیازەکان دەکات و بیری خۆی دەردەبڕێ و سەربەستییەکی وای هەیە کە بە ئاسانی نەخەڵەتێنرێ و بتوانێ تەنگوچەڵەمەکانی ژیان چارەسەر بکات و هەوڵیش بدات کە سەرکەوێت؟

ڕۆژێکیان کە قوتابییەکانی پۆلی شەشەم هاتن بۆلام بۆ وانەی (دارتاشی و کاری دەستی) زۆر دەنگ بەرز و بەهاوار بوون و هەرچەندە هەوڵمدا کە نەختێ بێدەنگ بن، بەڵام سوودی نەبوو، ئەوان هەر هاواریان دەکرد، ئینجا لە قوتابییەکانم پرسی کەچی بکەین باشە و کە لەپۆلەکەی خۆیان بارودۆخی ئاوا ڕوو دەدا چی دەکەن؟ ئەویش وتی : مامۆستاکەمان دەڵێت ئێستا بۆ ماوەی دوو دەقیقە هەموومان هاوار دەکەین بەهەموو هێزی خۆمان. ئینجا هەموو پۆلەکە بەیەکەوە هاوار دەکەین و ئیتر دوایی ناچار دەبین کە بێدەنگ بین. کە منیش ئەم ڕێگایەم بەکارهێنا لەگەڵیان سەرم سوڕما لە ئەنجامەکەی. وای لێهاتبوو ئەوانەی کە زیاتر لە هەموویان دەنگیان زڵتربوو نەیان دەتوانی ئیتر قسەش بکەن. ئەمە نموونەیەک بوو بۆ ئەوەی بڵێم کە بەزۆر دەمکوتکردن و بێدەنگکردنیان بە هاوارکردن بەسەریاندا کارێکی چەوتەو دەبێت ڕێگای تر هەبێت بۆ ئەوەی منداڵانی پۆل بتوانن هەست و بیری خۆیان دەربڕن، ئایا هەر مامۆستا پێویستە قسە بکات و ئەوان گوێ بگرن؟

ئایا چی دەبێت ئەگەر قوتابیانی پۆلێک بەش بکرێن بە کۆمەڵ کۆمەڵ و خۆیان باسی شتێک بکەن کە خۆیان هەڵی دەبژێرن و مامۆستا هەر ئەوەندە یارمەتیان بدات کە پێویستیانە نەک مامۆستا هەموو شتێک بکات و ئەوانیش سەیری بکەن. ئایا چی دەبێت ئەگەر گیروگرفتێک بدەی بە قوتابیان و داوایان لێ بکەی کە گفتوگۆی لەسەر بکەن و مامۆستا تەنها وەکو چاودێرک شتەکانی ئەوان بنووسێتەوەو یارمەتیان بدات؟

بەداخەوە لە پۆلەکانی ئێمەدا کەم گرنگی دەدرێت بە گفتوگۆ و چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەی نێوانی منداڵەکان، کە ئەمە لە ساڵەکانی یەکەم و دووەم و سێیەمیشدا دەبوایە ببێت بە کارێکی سەرەکی مامۆستا و پەروەردەکاران، چونکە بەمە منداڵ دەتوانێت هەستی دەروونی خۆی دەرببڕێت و فێری گفتوگۆکردن ببێت لەگەڵ کەسانی تردا و ببێت بە مرۆڤێکی سەربەخۆ و ئازاد و فێری ئەوە ببێت کە هەر کەسە مافی ئەوەی هەیە کە هەست و دەروونی خۆی وەکو خۆی هەستی پێدەکات دەرببڕێت، بەبێ ئەوەی بترسێ لەوەی خەڵکی تر وا بیر دەکەنەوە یان نا، ئایا ئەمە گرنگترە یان ئەوەی منداڵ ئاقڵانە و ڕێکوپێک دانیشێ لە شوێنی خۆی وەکو بت و سەرشۆڕی داواکانی مامۆستا بێت؟ ئایا پێویستی قوتابخانە نییە کە مرۆڤی دیمکرات و سەربەست پێ بگەینێ و بەربەرەکانی زۆرداری و دیکتاتۆریەت بکات؟

گوێڕایەڵی و ڕێزگرتن............................................
باوکێک چوو بۆلای مامۆستای منداڵەکەی و داخی دڵی خۆی دەربڕی و وتی کە منداڵەکەم بە گوێم ناکات، مامۆستاکەی وتی:
حەزدەکەیت منداڵەکەت بە گوێی هەموو کەسێک بکات؟
باوکەکە وتی : نەخێر حەزناکەم
مامۆستاکە وتی: جا منداڵەکەت باش ناکات کە خۆی بە تۆ تاقیدەکاتەوە
ستانلی میلگرم دەڵێ: گوێگرتن و گوێڕایەڵی نرخێکی زۆری هەیە بۆ مانەوەی مرۆڤایەتی بەڵام لەژێر ناوی گوێڕایەڵی و گوێگرتندا تاوانی وا ترسناک کراوە، کە لەژێر ئۆپۆزیسیۆندا نەکراوە.(ستانلی میلگرام – گوێڕایەڵی و دەسەڵات).هەرکاتێ باسی گوێڕایەڵی دەکەین، وشەی ڕێزگرتن خێرا دێتە پێشەوە.
وەکو گەورەیەک پێمان خۆشە کە ئەوانەی لە خۆمان بچووکترن گوێڕایەڵمان بن و لەوە (دەچێ) کە منداڵان ڕێزمان دەگرن. بۆ باوکان زۆر گرنگترە وەک لە دایکان کە منداڵەکانیان ڕێزیان بگرن و زۆرجار دایکیش یارمەتی باوکەکە دەدات بەوەی ئەگەر

منداڵەکە بە قسەی نەکرد، ئەوا کە باوکی هاتەوە پێی دەڵێت وشکاتی لێدەکات. کاتێ منداڵ تەمەنی دەگاتە(7 -9)ساڵان، ئیتر بینینی دەگۆڕێ بەرانبەر بە ڕێزگرتن و گوێگرتن.
PIAGETS پیاشێ دەڵێت:
منداڵ بیری دەگۆڕێ لەرێزی یەکلاییەوە بۆ ڕێزی دوولایی، بە مانای ئەوەی لەرێزی تەنهایی منداڵەوە بۆ گەورەکان بەرەو ڕێزگرتنی بەرامبەری و یەکسانی لەگەڵ گەورەکاندا و بۆئەوەی لەم پێشکەوتنەی منداڵ بگەین. دەبێت زیاتر وردبینەوە لەم تەمەنە و بزانین منداڵ بۆچی وای لێدێ. لە تەمەنی (5 -7) ساڵیدا منداڵ لە ژیانێکی تەماویدایە و بیری هەر لەلای خۆیەتی و زۆر زەحمەتە جیاوازی ببینێ لەگەڵ جیهانی دەوروپشتی، بە مانایەکی تر منداڵ لە نێوانی خەیاڵ و ڕاستیدا هاتوچو دەکات و جاری واش هەیە پێیەکی لە جیهانی خەیاڵدایە و پێیەکەی تری لە جیهانی ڕاستیدا. جا بۆیە سەرگوزشتەی وات بۆ دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ ڕاستی و جیهانی تۆدا ناگونجێ، بەڵام بەلای منداڵەکەوە ڕاستە و تۆش دەبێت ڕێزی بگرێت. منداڵە گەورەکان بە بەهێز و گەورە و زل دەزانێ، کە قسە دەکەن و هەڵسوکەوت دەکەن، منداڵەکە تێیان ناگات، ئەم ساڵانەی منداڵ پێی دەوترێ (ساڵانی سیحراوی) لەبەرئەوەی منداڵ بە چاوێکی پڕ لە خەیاڵ و سیحرەوە سەیری گەورەکان دەکات. ئەم گەورانە نیشانەی دەسەڵات و هێزن و منداڵیش تا ماوە بە گوێیان دەکات. هەرچەند هەندێجار (نا) بەکاردەهێنێ بۆئەوەی دژیان بوەستێتەوە و خۆی تاقیبکاتەوە
لەم تەمەنەدا (5 -7 ) ساڵان منداڵ بەبێ چەند و چۆن ڕێزی گەورەکان دەگرێ لەم وشەیەدا و لەم کاتەدا ڕێزگرتن مانای خۆشەویستی و بروایە بە گەورەکان لەلایەکەوە ترس و خۆ بە کەمزانینە لەلایەکی ترەوە. بەتایبەتی بەرامبەر بە باوک منداڵەکە باوکی بە پاشا دەزانێ با زۆر ناشرین و نارێکوپێک و هەژاریش بێت و دایکیشی شاژنە هەرچییەک بێت. ئەم سەرسوڕمان و خۆشەویستییە لەم کاتەدا لەبەرئەوەیە کە منداڵەکە جارێ فێری بەراوردکردن نەبووە. دایکوباوک نابێت بەهیچ جۆرێک شکی لێبکرێت و هیچ چەند و چۆنی ناوێت ئەمانە شوێنی خۆشەویستی و دڵنواییکەری منداڵەکەن.
هەروەکو ئەم خۆشەویستییە سنووری نییە هەروەها ترسەکەش سنووری نییەو بناغەی ئەم ترسە ئەوەندە قووڵە لە مێشکی منداڵدا کە زۆرجار ئەم ترسە لە ژیانی گەورەییدا دەردەکەوێت و نیشانەی دیارە. لەبەرئەوەی لە پێش (6 – 7) ساڵیدا ئەم ترس و هەست بە کەمزانینە لای منداڵ بە ئاشکرا دیارەو زۆرجار لەژێر ناوی ڕێزو گوێڕایەڵیدا خۆی دەنوێنی. بەڵام بەپێ خستنە ناو قۆناغی تازەوە ئیتر ئەم ڕێزو گوێڕایەڵیە یەکلاییە دەگۆڕێت و منداڵ داوای ڕێزی بەرامبەر دەکات. لە (9 – 10 ) ساڵیدا منداڵ ئەمەندە پێشکەوتووە کە ئیتر دوو دڵ دەبێت لە ڕاستی و چەوتی گەورەکان و بۆ منداڵەکە ڕووندەبێتەوە کە ئەو دەستگرتنەی گەورەکان بەسەریدا پێویست ناکات. لەم کاتەدا بۆ گەورەکان زەحمەتە کە بتوانن ئیتر بسەڵمێنن، کە ئەمانە هەر کابرا بەهێزو ترسناکەکەی جاران و ئەگەر هەوڵبدات ڕێزو گوێڕایەڵی منداڵەکان بپارێزێ بەوەی بڵێت دەبێت ڕێزم بگرن لەبەرئەوەی من گەورەم زۆر شتێکی هەڵە دەکات و کارەکە ئەوەندەی تر لە دەستیدەردەچێ و ئەو منداڵەش، کە دەهێڵرێتەوە لەژێر ڕێزی بەزۆردا دوادەکەوێت و تا مابێت ناتوانێت هەڵسێ و ڕاپەڕێ لە دژی ئەو ژێردەستییە و هەمووکات خۆی دەخاتە ژێر دەستی یەکێکی تر کە بڕیاری بۆ بدات. لە تەمەنی (7 -12) ساڵیدا ئیتر منداڵ ڕێزی گەورەکان ناگرێت هەر لەبەرئەوەی گەورەن، هەرچەندە دەبێت بە گوێی ئەوان بکات و گوێڕایەڵیان بێت.
ئەم باسە زۆرجار لەناو گەلانی کۆندا گرنگییەکی وای پێ نادرێ و کلتوری گەلەکە وای داناوە کە ڕێزو گوێڕایەڵی هەر لە کۆنەوە سەپێنراوە بەسەر خەڵکەکەدا و بەپێی پلەی کۆمەڵایەتی و ڕێوشوێنی تایبەتی خەڵکەکە ڕێزی گەورەکان دەگرن. ئەمە زۆرجار لەوە دەچێت باش بێت و وا دەردەکەوێت کە تەنها شێوەیەکی پیرۆزی ژیانە و کەس بۆی نییە بیگۆڕێ، زۆر نموونەت بۆ دەهێنرێتەوە کە پیشانی دەدات بەهۆی ڕێزگرتنی گەورەکانەوە خەڵکی لە تەنگوچەڵەمە ڕزگاریان بووە. چونکە ئەمە مەترسییە بۆ سەر پیاوانی دەسەڵاتدارو ئاینی و شوێنی کۆمەڵایەتیان لێ دەشێوێنێت و نایانەوێت لەجیاتی دەسەڵاتی ئەوان خەڵکی خۆی ئەوەندە وریا بێت کە بتوانێ ژیانی کۆمەڵایەتی خۆی ڕێکوپێک بکات و بەپێی پێکهاتنی سەربەست لە بەینیاندا ڕێککەون. جا بۆیە لێرەدا گرنگی مامۆستا دەردەکەوێت، کە چۆن دەتوانێت مرۆڤی سەربەست و ئازاد پەروەردە دەکات، نەک مرۆڤێک، کە پاسەوانی ئامانجی دەسەڵاتدارەکان بێت.
لەپەرتوکی(منداڵەکەت بۆ وا ئەکات)

منداڵی شەڕانی و هاروهاج و منداڵی بەستەزمان و بێدەنگ

لەم تەمەنەدا(5-7ساڵان) منداڵ فێری دروستبوونی گۆڵەمز بووە و زۆرجار دەیەوێت لاسایی دایکوباوکی بکاتەوە و ژیانی ماڵەوە لەگەڵ ژیانی نێو هاوڕێیان و ئەندامانی گۆڵەمز بەراورد دەکات. زۆرجار منداڵ بەهۆی بوونی تەنگوچەڵەمە لەناو خێزانەکەی و نەبوونی خۆشەویستی لەنێوان ئەندامانی خێزاندا هەوڵدەدات هەقی خۆی لەناو گۆڵەمزدا بکاتەوە بە ئازاردانی بەستەزمانان، بەمە دەبێت بە منداڵێکی شەڕانی و هاروهاج. زۆر ناخۆشە بۆ دایکوباوک کاتێک دەزانن منداڵەکەیان تووشی منداڵێکی شەڕانی بووە و هەموو ڕۆژێک ڕێگا بە منداڵەکەیان دەگرێت. منداڵەکەی ئێوەش بۆی نییە قسە بگێڕێتەوە ، لەبەرئەوەی بە ترسنۆک لە قەڵەم دەدرێت، لێرەدا تەنگوچەڵەمەکە دوو سەرییە، یان ئەوەتا دەست دەخەیتە ناو کاری منداڵەکەوە و بە منداڵە شەڕانیەکە دەڵێیت و داوای لێدەکەیت کە واز لە منداڵەکەت بهێنێ، ئەمەیش دەبێت بەهۆی ئەوەی منداڵەکەت لای منداڵانی تر بە ترسنۆک لە قەڵەم بدرێت، یان ئەوەتا دەست ناخەیتە ناو کارەکەوە و منداڵەکەت وا دەزانێ کە بەڕاستی خۆشتناوێت و گوێینادەیتێ و یارمەتینادەیت. بۆئەوەی یارمەتی منداڵێکی شەڕانی بدەیت و منداڵێکی تر بپارێزێت لێی، پێویستە بگەڕێیتەوە بۆ شیکردنەوەی بارودۆخی خێزانەکەی، ئایا منداڵی یەکەمە؟ ئایا دایکوباوکی

بەیەکەوە دەژین؟ یەکێکی مردووە؟ ئایا خێزانێکی گەورەن یان بچووک؟ ئایا شەڕوشۆڕ زۆر لە ماڵەکەیاندا هەیە؟ ئایا دایکوباوکی منداڵەکە وایان پێ باشە و واپیشانی منداڵەکەی دەدەن، کە باشترەشەڕانی بێت؟ منداڵێکی بە لەش قەبە و گەورەیە؟ کەموکوڕییەکی لەشی هەیە؟ و زۆر لەم پرسیارانەی کە پێویستە ڕوونبکرێنەوە پێش ئەوەی بتوانی یارمەتی بدەیت. بەهەمان شێوە ئەو منداڵە بەستەزمانەی کە تووشی ئەم منداڵە شەڕانیە بووە. ئایا ئەم منداڵە بە خۆڕایی ڕقی خەڵکی هەڵدەسێنێ؟ ئایا نەخۆش و کەموکوڕی لەشی هەیە؟ ئایا منداڵێکی پاک و تەمیز و ڕێکوپێکە یان منداڵێکی چڵمن و نەخۆش و لاوازە کەوا لە منداڵی شەڕانی دەکات شەڕی پێ بفرۆشن؟ ئایا تازە هاتونەتە ئەم گەڕەک و شارەوە و منداڵەکە کەس ناناسێ؟ ئایا لە کەمایەتییەکی وان کە لەچاو خەڵکیدا دواکەوتوون؟ هەر دایکو باوکێک بەجۆرێک ئەم تەنگوچەڵەمەیە چارەسەر دەکات. یەکێک داوا لە منداڵەکەی دەکات کە ئیتر بەو شوێنانەدا نەڕوات کە منداڵە شەڕانیەکەی پێدا دەڕوات. یەکێکی تر داوا لە منداڵەکەی دەکات کە ببێت بە هاوڕێی و بەمجۆرە خۆی لێ بپارێزێت، یەکێکی تر داوا لە منداڵەکەی دەکات کە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکدا هەڵسێ و دانیشێ و قەت بەتەنها نەبێت، یەکێکی تر لەگەڵ منداڵەکەیدا دەچێت بۆ قوتابخانە. یەکێکی تر هەوڵدەدات کە پەیوەندی بە مامۆستای منداڵەکەیەوە بکات و لە قوتابخانە بگەیەنێ کە منداڵەکەی لەچ بارێکدایە. یەکێکی تر پەیوەندی دەکات بە دایکوباوکی منداڵەکەوە. بەهەر حاڵ ئەمانە هەموویان ڕێگای جیاوازن بۆ پاراستنی منداڵەکەت لە منداڵی شەڕانی تا ئەو کاتەی منداڵەکەت دەتوانێت بچێت بۆ قوتابخانەو لە دەرس و کاری خۆیدا دوانەکەوێت. بەڵام ئەگەر کارەکە لەمە زیاتر ڕۆیشت و منداڵەکە نەیتوانی بچێت بۆ قوتابخانە ئەوسا دەبێت بەهەموو لایەک هەوڵبدرێت بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێک. بەڵام لەهەموو بارودۆخێکدا باشتر وایە کە دایکوباوک بەهۆی گفتوگۆی ناوخێزانەوە هەوڵی یارمەتیدانی منداڵەکە بدەن. بە ڕوونکردنەوەی جۆری هەڵسوکەوت و ڕەفتاری لەگەڵ هاوڕێکانیدا، بەڵام لە هەموو حالەتیکدا ئەبیت مندالەکە ئاگادارکرێتەوە لە هەموو کاریک کە ئەکریت بۆ یارمەتیدانی و بەبێ خواستی ئەو هیچ شتێک نەکرێت (لە پەرتوکی منداڵەکەت بۆ وائەکات)

منداڵ و فشەکردن..............................................

منداڵان ئەمڕۆ زووتر لەجاران پێدەگەن. ئەو تەنگوچەڵەمانەی کە جاران تووشی گەنجان دەبوو، ئێستا تووشی منداڵان دێن. ئەمە بە ئاسانی لە کچاندا دەبینرێت وەک لە کوڕان، بەڵام هەردووکیان هەر زووتر پێدەگەن و دەتوانرێت بوترێت کە منداڵێکی 10 ساڵان لە بالق بووندایە. بۆ منداڵێکی تەمەن(10 ساڵان) گەورەیی لەش و ڕووکەشی جوان گرنگییەکی زۆری هەیە. فشەکردن مانای ئەوەیە منداڵەکە شتی وا دەدۆزێتەوە یان زیاد لەخۆی باسیان دەکات کە لە سنووری ڕاستی دەچێتە دەرەوە. جیاوازی لەنێوان منداڵێک کە بەباشی باسی شتێکی خۆی دەکات بۆئەوەی شانازی پێوە بکات، لەگەڵ منداڵێکدا کە فشە دەکات زۆرە، ئەو منداڵەی کە فشە دەکات ڕازی نییە لەخۆی، خۆی بەکەم دەزانێت، هەر لەبەرئەوەی بچووکە یان لاوازە یا زۆر گەورەیە یان لەبەر هەرهۆیەکی تر.

ئێستا کاتێکی باشە بۆئەوەی بزانیت کە منداڵەکەت بیر لەچیدەکاتەوە و خەریکی چییە، چونکە زۆرپتر ناخایەنێ کە منداڵەکەت دەکەوێتە ژیانی هەرزەکارییەوە و ئیتر دەرگای باسی زۆر شت لە نێونتاندا دادەخرێت. لە ڕاستیشدا منداڵەکەت دەیەوێت باسی ئەو شتانەت بۆ بکات کە خۆی دەخوازێت باسیان بکات نەک ئەوانەی تۆ دەتەوێت. ئەگەر فشە بکات لە بارەی کچانەوە ئەوە زیاتر لەبەرئەوەیە کە متمانەی تەواوی بەخۆی نییە، کە بتوانێت بەشێوەیەکی ئاسایی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکات، یاخود بەسەروچاوی خۆی ڕازی نییە. کاتێ کە منداڵێک متمانەی بەخۆی نییەو خۆی بە کەمدەزانێت. مەرج نییە بەئاشکرا باسی ئەم شتانە بکات و بگرە نەفرەتیشی لێدەکات. لەبەرئەوە باشترە کە بۆی باسبکەی تۆ بڕوای پێدەکەیت هەرچەندە واش نییە.

باشترە هەوڵبدەیت شتی باش بدۆزێتەوە و مەدحی بکەیت. دەرهەق بەو شتە باشانە، بۆ نموونە ئەگەر منداڵەکەت کورت بوو و لەکاتی بالقیدا بوو ئەوا بەلایەوە زەحمەتە کە ببینێت هاوڕێکانی گەورە دەبن و ئەمیش هەر لە شوێنی خۆیەتی، لەبەرئەوە دەستدەکات بە فشەی وا کە پەیوەندی هەبێت بە شەڕ و لە خەڵکهەدان و باسی ئەوە دەکات چۆن بەسەر کوڕە گەورەکەدا سەرکەوت و خستی بە زەویدا. لێرەدا دەتوانیت لایەنێکی باشتری منداڵەکە بدۆزێتەوە، وەک: ئەگەر خۆشەویست بوو لەناو هاوڕێکانیدا یان زیرەک بوو مەدحی بکەیت، چونکە پێیخۆشە خەڵکی باسی لایەنە باشەکانی بکەن، نەک خۆی ناچار بێت کە باسی ئەو لایانەی بکات کە ڕاست نین. هەندێکجار منداڵ فشە دەکات بۆئەوەیە کە دڵی دایکوباوکی خۆشبکات، بەوەی لەوە تێبگەن ئەو هیوایەی بەمیان هەبووە بەفێڕۆ چووە و نەیتوانیوە بەدڵی ئەوان بێت. جا لەبەرئەوە کوڕەکە دەیشارێتەوە و ناچاردەبێت کە فشەیان بۆ بکات و زیادیشی پێوە بنێت. ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ هیوای زۆری دایکوباوک بە منداڵ و باشتر وایە هەر زوو دانیشن لەگەڵیدا و باسی ئەو هیوایەی بۆ بکەن. چونکە منداڵ زۆر هەستی ناسکە بەرامبەر هەستی دایکوباوک و نایەوێت دڵیان بشکێنێ. جا لەبەرئەوەی کاتێ کە بۆت دەرکەوت منداڵەکە ناتوانێت هیواکەت بهێنێتە دی، چونکە لە توانای ئەو زیاترە، چاکتر وایە بەهۆی گفتوگۆوە لەگەڵ منداڵەکە وا بگەنە بڕوایەک کە هەردوولاتان ڕازی بن و بۆی باس بکەن، کە خۆشەویستی ئێوە بۆ ئەو پەیوەندی نییە بەسەرکەوتن یان ژێرکەوتنی ئەوەوە و ئێوە هەر ئەوتان خۆشدەوێت

لەپەرتوکی (منداڵەکەت بۆ وائەکات)

## بەشی پێنجەم

### دایکوباوکی ونبوو

لەهەموو شەڕێکدا کە گەورەکان دەیکەن، دۆڕاوی یەکەم منداڵە و ژێرکەوتووی ڕاستەقینەیە، منداڵ دەبێت بە قوربانی دواکەوتوویی گەورەکان و سەرگەردان دەبێت، نموونەی ئەم منداڵانە لە جیهاندا زۆرن و لەناو ئەو گەلانەدا کە وەکو گەلی کورد دووچاری حوکمڕانی زۆردارو دیکتاتۆریەت بوونەتەوە هەن. لەهەندێ لەو وڵاتانەدا وەکو ئەرجەنتین و بەرازیل لە ئەمریکای لاتین پۆلیس ڕاویان دەکات و بە کۆمەڵ ونیان دەکەن. لە ئەفغانستان و بەنگلادیش و زۆر وڵاتانی تری ئاسیاییدا ئەم منداڵانە بێکەسن و سەرمایەدارەکان بەهەموو جۆرێک بەکاریان دەهێنن. ئەم منداڵانە لە کوێ بن یەک شت کۆیان دەکاتەوە ئەویش ئەوەیە کە خۆشەویستییان لێ سەندراوەتەوە و تووشی ژیانێکی سەخت بوون. کاتێ پیاو باسی منداڵی کورد دەکات، ناتوانێت چاو لە ئاست ژیانی ئەو منداڵانە بنووقێنت کە دایک و باوکیان ون بوون. ئەم منداڵانە زۆرن لەناوماندا و ئێمەش کەم دەزانین لە بارەیانەوە، ئایا منداڵێکی ساوا چۆن ژیان دەباتە سەر و چۆن دەژی و هەست بەچی دەکات دوای ئەوەی کە دایک و باوکی ون دەبن. چۆن سەیری کۆمەڵ دەکات و چی لێ بەسەردێت و چۆن دەتوانێت ئەم بارە گرانە هەڵگرێ و ئێمە چۆن دەتوانین یارمەتی بدەین؟

زۆربەی زۆری منداڵانی کورد زۆر باش لە بیریانە کە چۆن چەکدارەکانی ڕژێم بەیانییەکی زوو هاتوونەتە سەریان و باوکیان ڕاکێشاوەتە دەرەوە و فڕێیان داوەتە ناو ئۆتۆمبێلەکەوەو ئیتر(ون)بوون. لەبیریانە چۆن خۆشەویسترین کەسیان لەژیاندا لێی دراوەو بە پۆستاڵی سەربازە دڕندەکان یان سیخوڕە خوێنتاڵەکان سەریان خراوەتە ژێر پێ لەققەو قۆناغی تفەنگ و دەمانچەوە، بەبێ ئەوەی بتوانێ هیچ بکات یان فریای ئەوە بکەوێ خۆی بشارێتەوە یان بەرگری لەخۆی بکات. لەبەرئەوەی زۆر لەو منداڵانەی لەناوماندا دەژین. هەر بەو هیوایەوە دەژین کە (ونبووە)و ڕۆژێ لەڕۆژان دەگەڕێتەوە خۆ ئەو وەکو منداڵانی تر نەبینییوە کە خۆشەویستەکەی بمرێ، نەیدیوە بنێژرێت و خەڵکی بۆ سەرخۆشی بێت بۆ ماڵیان و دانیشن و بگرین و ئیتر دوایی بە بینینی خۆشەویستەکەی هاتبێت. ئەم هەر هیوای ماوە و ئەوەی هیوای نەماوەو بڕوا ناکات کە خۆشەویستەکەی ڕۆژێ لەڕۆژان دەگەڕێتەوە پێویستە ئێمە بتوانین لە ژیانیان تێبگەین و یارمەتیان بدەین و کەمترین یارمەتی ئێمەش ئەوەیە کە(گوێیان لێ بگرین) و خۆشمان بووێن. بابزانین چۆن منداڵێکی(8 – 9)ساڵان بەسەر ئەم کارەساتەدا سەردەکەوێت یان بەلای کەمەوە بەناو کارەساتەکەدا دەڕوات، ئیتر سەرکەوتن و .ژێرکەوتنی دەکەوێتە سەرئاستی یارمەتی کۆمەڵ بۆی

منداڵ وەستایە لە هیوا نەبڕین و چاوەڕوان کردندا و لە گەورەکان زیاتر دەتوانێت چاوەڕوان بێت، لەسەرتادا هیچ گومانی لەوەدانییە کە خۆشەویستەکەی دێتەوە. زۆرجار دادەنیشێت و بیری لێدەکاتەوە. بەتایبەتی کاتێ بە تەنهایە یان لەسەر جێگاکەیەتی بیر دەکاتەوە ئێستا ئەو لەچیدایە دەزانێ کە خۆشەویستەکەی لە ترس و ناخۆشیدایە و لەوانەیشە ئازاری بدەن و لێی بدەن، بەڵام دەزانێت کە خۆشەویستەکەی ئازایە و دەتوانێت بەرگەی ئەم لێدانە بگرێت و گوێ بە ئازار نادات. ئەم منداڵە بە خەیاڵ زیندانەکەی دێتەوە بەرچاو و هەوڵدەدات بەلای کەمەوە کونێکی بچووکی تێبکات بۆئەوەی ڕووناکی بۆ خۆشەویستەکەی لێوە بەرێتە ژوورەوە و دڵخۆشی بکات. .ڕۆژ دەبژێرێ و هەرجارێک ئۆتۆمبیلێک لەبەردەرگا دەوەستێت ڕادەکاتە دەرەوە بۆئەوەی بزانێ خۆشەویستەکەیەتی یان نا

ڕۆژ دەڕوات و ڕۆژ دێت و خێزانەکە هیچ هەواڵێکی خۆشەویستەکەیان نابیستن و منداڵەکەش دەکەوێتە ترسەوە هەوڵدەدات کە دەموچاوی گەورەکان بخوێنێتەوە و شەو تا درەنگ هەر بە خەبەرە و خۆی لەناو جێگاکەیدا مات دەکات بۆئەوەی گوێی لە قسەی گەورەکان بێت و بزانێت دەڵێن چی. ئایا ئەوان شتێک دەزانن کە ئەم نایزانێت؟ هەر گۆڕانێک لە ڕەنگ و دەنگی گەورەکاندا ڕوو بدات ئەم خێرا هەستی پێدەکات و لای خۆی تۆماری دەکات هەر نیشانەیەکی بێهوایی لە سیمای گەورەکاندا ببینێت تووڕە دەبێت، چونکە خۆشەویستەکەی ئەم هەر دێتەوە و ئەمە پێویست بە بێ هوایی ناکات. زۆرجار یەکێک لە گەورەکانی خێزانەکە بەجارێ هیوای بەمانی خۆشەویستەکەی ئەم نامێنێت و دەزانێت کە ئیتر چارەسەر نییە، لەوانەیە ئەم گەورەیە مامی یان خاڵی یان کەسێکی تری ناو خێزان بێت و داوای دانانی پرسە دەکات، بەڵام منداڵەکە تووڕە دەبێت و دەڵێت: چۆن وا دەڵێیت تۆ برای ئەویت و ئەو تۆی خۆش دەویست کەچی تۆ وا دەڵێیت، تۆ هیچ نازانیت و کەچی قسەی خراپ دەکەیت، من دەزانم کە ماوەو ڕۆژێک هەر دێتەوە.

بەمە مامی لەبەرچاوی دەبێت بە مرۆڤێکی خراپ و تەنانەت بە دوژمن و خیانەتکاریش، ئیتر ناچار ڕوو دەکاتە دایکی و دەست دەکات بە پشکنین و بەدوای ئەوەی ئایا دایکی چی دەڵێت؟ و چۆن بیر دەکاتەوە؟ خۆ ئەگەر دایکیشی هەروا بیربکاتەوە، ئەوا ئیتر منداڵەکە تووشی خەم و خەفەتێکی زۆر دەبێت و وا دەزانێت کە ئەمانە پیلان دەگێڕن و تەنها ئەمە کە بڕوای بە هاتنەوەی
خۆشەویستەکەی نەبڕیوە، بەخۆی دەڵێ کە ئەگەر هەموویان هیوا ببڕن بە هاتنەوەی ئەوا من هیوا نابڕم و من دەزانم کە هەر ماوە و دێتەوە و ئەوساش بابزانێ کە بەلانی کەمەوە یەکێک هەیە کە چاوەڕێی دەکات و بڕوای بە مانی ماوە. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێجار ناتوانێ جۆرە هەستێکی ڕەق بەرامبەر خۆشەویستەکەی دەرنەبڕێ و لە دڵی خۆیدا بیر نەکاتەوە کە بۆچی نەیتوانیوە هەر چۆنێک بێت لە کەسێکدا کە لە زیندان هاتۆتە دەرەوە هەواڵێکی بۆ بنێرآ. یاخود خۆ هیچ نەبوایە فێڵێکی هەر دەدۆزیەوە بۆ ئەوەی پیان ڕابگەێنێ کە ماوە، ئایا ئەمانی لەبیرچۆتەوە؟ گوێیان ناداتێ؟ یان هەقی ئەم سیاسەت و سیاتکارییەی چی بوو؟ نەی دەتوانی ئەویش وەک ئەوانی تر ڕابکات و ئاگای لە خۆی بوایە؟ کاتێ کە منداڵەکە وا بیر دەکاتەوە تووشی ویژدان بریندارى دەبێت و چاو دەخشێنێتەوە بە بیرو هۆشی خۆیدا و ئەمجارەیان ئیتر خۆشەویستەکەی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاستی فریشتە و پیاوچاکان. کەٍئەمەش لەگەڵ ئەو ڕەخنەیەدا ڕێک ناکەوێت کە لە دڵیدایە و تووشی نارەحەتییەکی گەورە دەبێت و وای لێدێت کە ئیتر ناتوانێت ئەم هەموو خەم و خەفەت و گرفتانە هەڵگرێ و دەست دەکات بەوەی شک لە مانی خۆشەویستەکەی پەیدا بکات و وا بیر بکاتەوە کە(لەوانەیە نەمابێ، بۆیە نامەمان بۆ نانێرێت).ئەمە ئیتر ژیانی منداڵێکی(خۆشەویست لێ ونبوو)و بەم شێوەیە لەنێوانی هیوایەکی خەفەتاوی کە نایەتە دی لەلایەکەوە و خەفەتێکی پڕ لە خەتا لەلایەکی ترەوە، وا لە منداڵەکە دەکات کە قەت نەگەشێتەوە.لەوانەیە بڵێین کە باشتر بوو بۆ منداڵەکە بە چاوی خۆی لاشەی خۆشەویستەکەی بدیبایە، هەرچەندە زۆر برینداریش کراوە و لێی دراوە و ئاسانتر بوو لەگەڵ کەس و کاری خۆیدا پێکەوە ئەم خەفەتەی بخواردایە و نەبوونایە بە دژومنی و پیلانی لێ بگێڕن.

چۆن دەتوانین یارمەتی ئەم منداڵە بدەین؟

ئەمە کاری هەموو کەسانی دەورووپشتی منداڵەکەن. بوونی کەسێکی تێگەیشتوو کە گوێی لێبگرێت. وتمان کە منداڵەکە هیوایەکی زۆری بە هاتنەوەی خۆشەویستەکەی هەیە، ئەمە تەنگوچەڵەمەی منداڵەکەیە و یارمەتی ئێمەشدئەبێت لێرەوە دەست پێبکات،( یارمەتیدانی منداڵەکە لە نێوانی هیوا و گلەیییەکەدا کە بتوانێت پارسەنگێک بدۆزیتەوە بۆ ئەم دوو جۆرە هەستە). کاتێک کە منداڵیک لە نێوانی ڕق و خۆشەویستیدایە تەنها لایەنی خۆشەویستی نەگری، بەڵکو بە شێوەیەکی ماقول یارمەتی بدەیت کە ئەوجۆرە بەگەوەرە زانینی خۆشەویستەکەی بگەڕێنێتەوە سەر باری ئاسایی خۆی و خۆشەویستەکەی وەکو مرۆڤ و ئەو وێنەیەی ئەو لە خەیاڵیدا دروستی کردووە بە فریشتە و پەری دادەنێت بسڕێتەوە کاتێک کە منداڵ لەنێوانی هیوا و خەفەتدایە هەوڵبدەین، کە خەفەتەکەی کەم بکەینەوەو هیوای منداڵەکە بگەڕێنینەوە بۆ سروشتی جارانی خۆی. ئەوەی منداڵ پێویستیەتی خۆشەویستییەکی ڕاستەقینەیە، کە بەلایەنی کەمەوە لە خۆشەویستی خۆشەویستەکەی نزیک بێت.

## سەرچاوەکان

بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبە لەم سەرچاوانەی
خوارەوە سوود وەرگیراوە:


1- BRATT, NANCY DEN TIDIGA JAG UTVECKLINGEN. ÖVERSÄTTNNING AV MARGARETA EDGA. ALBERT BONNIERS BOKTRYCKERI 1975 STOCKHOLM.

2- RUBINSTEIN. MARK DITT BARN.

3- OTTERSEN. OTTAR FÖRÄLDRARKUNSKAP. DE LYCK-LIGA ÅREN. 1974 WERBUM, STUDIEBOKFORLAGET.

4- KATS. MADELEINE ATT HA SMÅ BARN. ALBERT BON-NIERS BOKTRYCKERI 1969.

5- WAHLGREN. ANNA FRÅGA ANNA OM BARN. ALLER BOK 1986, SCAND BOOK, FALUN.

6- SPOCK. BENJAMIN SKÖT OM DITT BARN. NATUR OCH KULTUR.

7- GOLDINGEN BARBRO & MAGNUSSON. GUNILLA FEM ÅR AV DITT LIV. W & W STOCKHOLM 1982.

8- M. GREG ELIZABETH & ANDRA. MAMMA VAD SKA JAG GÖRA. OVERSATTNINGEN GERTURD HALLVIG NEW YORK USA. ALBERT BONNIERS BOKTRYCKERI 1971 STOCK-HOLM.

9- SOCIALSTYRELSEN. LEVA MED BARN. 1983 BERLING-ES, ARLOV 1985 LIC FORLAG.

10- FREDRIKSSON, MARIANNE & HANSSON. BRITTA KÄRLEK, JÄMLIKHET, ÄKTENSKAP.

11- TRAUMATISK STRESS. SÄRTRYCK AV EN SERIE I LÄKERTIDNINGEN. 1992.

12- THOLSTRUP, ANNETTE. DITT LILLA BARN OCH DU. OVERSATTNING. HANSSON SVANTE. NATUR OCH KULTUR, STOCKHOLM 1993.

13- GUSTAVSSON, LARS H. BARNA PAPPA. NORSTEDS FORLAG AB 1991.